لە چاپکراوەکانی
کۆڕی زانیاری کورد

# ڕاسکۆ



شانۆگەرییەکی شیعرییە لە پێنج تابلۆدا

شێرکۆ بێکەس

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# ئاسک

## شانۆگەرییەکی شیعرییە لە پێنج تابلۆدا

شێرکۆ بێکەس

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٨

کەلەپوور بناغەی ئەم شانۆگەرییەی داوەتەوە و لە کلاورۆژنەی بەیتە میللی و فۆلکلۆرییەکانیەوە تیشکی وەرگرتووە و لە کوورەی ئەواندا قاڵکراوەتەوە .
ئاوڕدانەوەیەکە لە سەردەمە تاریکەکانی رابووردووی دوور.
ئەو کارەسات و بەسەرهاتانەی لە واقیعی تاڵی رۆژانەی ژیانی ئەو سای دڵدارانداا لە نێوان خێر و شەڕدا لە چنگاوشبوونی‌یەکتر و زۆرانبازییەکی سەختدابوون .
رووداوەکان لە سنووری کات و وەختی ئەو سەردەمانەدا ماونەتەوە و بە لای رابووردووی نزیك و ئێستەماندا نەهاتوون .

# کەسانی ئەم شانۆگەرییە

١ ـ پیرۆت = شوانەی گوند
٢ ـ مام وسۆ = رەزەوان
٣ ـ بایز = کوێخا
٤ ـ سوارە = هاوڕێی پیرۆت
٥ ـ خاوەر = کچی کوێخا و دڵخوازی پیرۆت
٦ ـ هەمین = ژنی کوێخا بایز
٧ ـ پیربال = ئاشەوان
٨ ـ باپیر = بە تەمەنترین پیاوی گوند
٩ ـ مەمەند = کوڕەزازای باپیرە ، منالی یەکەم
١٠ـ زۆراب = کوڕەزازای باپیرە ، منالی دووەم
١١ـ حەمە = قەتارچی

لەگەڵ :

آ = کۆرسی سەرەکی
ب = کۆرسی منالان
ج = حیکایەتخوان
د = دەرهێنەر

هەروەها :

کۆمەڵە خەڵکی ، ڕێبواری ، چەند دەنگی .

# تابلۆی یەکەم

**دەرهێنەری شانۆگەرییەکە :** « لەگەڵ دەستپێکردندا ، بازنی ئاسکێ ئەبیسترێ ، بێدەنگێ ، پەردە بەئاستەم ئەکرێتەوە و دەرهێنەر دێتە پێشدەمی شانۆکە و رووئەکاتە بینەران :

میوانە خۆشەویستەکان ، شەوتان رۆناك
چاوتان رۆناك ..
بەخێرهاتن بۆ بینینی ئەو چیرۆکەی
لەم ســاتەوە
وشەکانی ئەبزوێن و ئەبنە تابلۆو ،
ئەبنە ئەکتەر ..
تا تەماشای وردی ئێوە لە سەرە رێی ،
بەسەرهات و .. ناوگێژەنی کارەساتا ،
راگرێت و .. بیکا بە سەرپشك و رابەر

★ ★ ★

میوانە خۆشەویستەکان
من تەنیا بۆ ئەوە هاتم ..
دیدەنیتان .. لە ماڵی ئەم شانۆیەدا
وەك ماڵانی کوردەوارێ
بخەمە سەر دیدەکانمان
من پێش بینینتـــان ناکەوم

« ئاسك » چیەو چۆنە و بۆچی ؟!
ئەتانەوێ و ناتانەوێ ؟!
ڕقتان لێبێ و خۆشتانبوێ
من نادوێم و شانۆکەمان :
با خــۆی بدوێ
میوانە خۆشەویستەکان من ئەڕۆم و ،
لەگەڵ « ئاسك » جێتاندێڵم
دیسانەوە .. شەوتان ڕۆناك
دڵتان ڕۆناك .

**« ئەڕوات »**

« پەردەکە بە تــەواوی ئەکرێتەوە ، حیــکایەتخوان ، لە جێگەی بــۆ تەرخانکراوی خۆیدا ئەبینرێ ، لەم دیمەنەدا ، دیویناوە و بنەبانی شانۆکە تاریکەو ، ڕۆناکێ بەتەنیا لە بەژنی حیکایەتخوان ئەدرێ و پێ بــە پێی هەمۆ بزۆتنەوەیەکیشی چەپکە تیشکەکە لەگەڵیا ئەڕوات »

**حیکایەتخوان :**

هەبۆ .. نەبۆ .. دێرزەمانێ
کاتێ باپیرە گەورەمان
تین و تاوی بازۆکانی ئەچۆن بەگژ
تاوێرە بەردی چیادا
کاتێ هێشتا خوێنی لاوێ ئاگرێ بۆ
لــە لەشــیانداو
چۆکی بە تۆف و وەیشۆمەی :
گەوەی شاخەکان دائەدا
سەردەمێ بۆ .. ژیان ئاوا بەرپێکانی
رۆشن نەبۆن

پەنجەرەی بیر •• لەسەر وشە داخراو بوو
نسێی زانین •• بەستەڵەکی بێهەتاو بوو
لەو ڕۆژەدا •• هۆشیش وەکو قوتیلکەکان
کز ئەسووتا
نەی ئەتوانی تاریکایی ناو دارستان
ڕوناك بکا
هەژارەکان لەناو گەروی
مەرگ و ژانـدا
پاروی گریاویان قووت ئەدا
تا گزنگیان ئەخستە ناو :
دوای ئێوارەی ئەموستەچاو
ڕەنجیان ئەداو •• ڕەنجیان ئەدا

★ ★ ★

لەو دەمەدا ••
پەندی پیران •• ڕازەوێ بوو
یاسا لەناو ئەودا ئەژیا
گرێکوێرەی گێروگرفت ••
ئەدرایە دەس خۆشەویستی بیکاتەوە
تاکو گفتار •• لە ئاوێنەی ڕۆژگاردا ••
شەوقی چاکە بداتەوە ••
ڕۆشنیکات بەر پێی کردار

★ ★ ★

هەبوو •• نەبوو لەو دەمەدا
گوندێ هەبوو

پێیان ئەوت : گوندی « خەزان »
لە بناری چیایەکدا ،، راکشابو
سەری لەناو نزارێکداو ،
قاچەکانی لەناو شەپۆلی تورەبوی ،
چەمێکدا بو ،،
چیا هەزار بەهەزارو سەخت و سەرکەش
گەلێ تەنگی
پلەی خزی
ملەی بەرزی
ئەشکەوتی قوڵ و زەبەندی
جەنگەلی و ،، دارودەوەندی
موچڕکی ترس و سامیان ، تیا :
نشیمەن بو
لە جوانیشدا ،، بەهەشتێکی
بەدەگمەن بو

★ ★ ★

پایزێ هات ،، سەرمای چیا
داروباری رووتکردەوە
چەم ،، هەڵلەرزی
شوانەی گوندی مل نوقمبوی
ناو فەرەنجی ،،
دەستی سەر گالۆکی تەزێ
خەڵکی خەزان ،،

بەر لە هێرشی ناکاوی تۆشی زستان
کەوتنە خۆیان

« تاریکی ،ئەڕوات »

« شانۆ ڕۆناکئەبێتەوە ، دیمەن گوندەکەیە و شوانەی گوند (پیرۆت)ە و ، بە قەد پاڵی چیاوەیە و پاڵیداوە بە گابەردێکەوە و خەریکی شمشاڵلێدانــە ، هــەر دوای چەند ساتێ ، بە بێزاری‌یەوە ، شمشـــاڵەکەی ئـــەکاتەوە بەبـــەر پشتێنەکەی‌داو ، هەڵئەسێتە سەرپێ ، ئەکەوێتە هات‌وچۆکردن ، ئنجا لەبەر خۆیەوە ئەڵێ :

**پــیرۆت :**

چوار ساڵ .. چوار ساڵ .. چۆن‌تەواوبێ ؟!
ئەی کێ ئەڵێ تەواویش‌بێ ..
ئەو .. ئەمداتێ
ئەی کێ ناڵێ هەمۆ ڕەنجم بە با نادا
ئەی کێ ناڵێ ؟!

« وچان »

وەك دڵی .. ئەم دێیە ..
دڵم لەو کرمێیە

« وچان »

خوێنی ئەکەمە کاسەوە
چۆنی نادا ؟!
وا جارێ سێ ســـالیم پسان
خوا گەورەیە .. خوا .. خوا

« وچان »

نەء .. ناتوانێ .. گوندی خەزان
گەورە و بچۆك .. لەو بەڵێنە ئاگادارن

ئاشنا و ڕۆشنا .. لەگەڵ مندان
نەء .. ناتوانێ !

« وچان »

ئاخ شوانکارێ .. ئاخ تەنیایێ
هەر خۆم ، بێکەس ، خوایە .. خوایە
بۆ نەتدامێ تەنیا خوشکێ
گەر وابوایە ..
ئیستە من وا کوێرەوەریم
ئەم شاخ و ئەو شاخ ئەگێڕا ؟

« وچان »

ماڵم ئەبێ ؟!
ئەبمە خاوەن چەند سەر مەڕێ ؟!
خۆم بۆ خۆم شوانێتێ ئەکەم ؟
تەم لەسەر چاوم لائەبەم ؟
« بێدەنگێ ، زەردەخەنەیەك ئەیگرێ ، گوڕ و تینێکی دێتەوە بە بەردا »
بەڵام لەبەر چاوە جوانەکانی خاوەر
چۆن دەربەست بێم ؟
چۆن بهێڵم .. کە بێزارێ دڵکوێرمکاو ،
ترسی لە گیانم بنیشێ
دەربەستنایەم .. ئەهێنێ گەر
چاوەڕوانیم .. دە ساڵیتر تۆل بکێشێ
دەربەستنایەم ،
دەربەستنایەم !

« وچان »

مەلای دێ
ئەو دنیا دیتەیە

راستئەکا •• پێم ئەڵێ :
کوڕم ئارام
ئارامی ( ئەیوب )ت هەبێ •

**« وچان »**

ئەمجارە مەلام دی پێی ئەڵێم
قوربان تۆ •• هەر ئەڵێ •• ئارامی ( ئەیوب ) و ••
پێم نالێی •• کام ئەیوب ؟! لە کوێ ؟!
پێی ئەڵێم : حەزئەکەم بزانم
ئەو •• چەند ساڵ •• ئارامی گرتبێ
ئەویش هەر وەکو من
حەزی لە :
خاوەرێ کردبێ ؟!

**« وچان »**

« مام وسوّی رەزەوان دێتە ژوّرەوە ، ئەگاتە لای پـیروّت ، سلاّودەکاو ، لە تەکیەوە دائەنیشێ »

**پـیروّت :**

وەی سەرچاو مام وسوّ
ونی •• ون •• ناتبینم ••
قسەتم ئەوەندە پێخۆشە
وەك تینوّ وەهام بۆی
پێم نالێی •• تۆ لەکوێی ؟

**وسـوّ :**

پیروّت گیان •• نازانی
ئیش وکار هێند زۆرە
لـــە بن دێ ؟!

خوا ئاگای لێیەتی سرەوتم هەر نیە !

**پیرۆت :**

ڕاستئەکەیت .. ئەزانم خۆت تەنیاو ،

ڕەزەکەش ...

**وسۆ :** « قسەکەی پێئەبڕێ »

مەپرسە .. ئەوەتەی هەستاوم

من هەر داو دائەنێم بۆ ڕێوی

ئەزانی .. چیئەکەن بەو ڕەزەم

مەپرسە .. ئەم سەرەم چەند قاڵە

وەڵلاهی نازانم چیئەکەم !

**پیرۆت :**

پێمبڵێ .. ئەمڕۆکە .. هیچتگرت ؟!

پێوەبوون ؟! ..

مام وسۆ .. گوێبگرە

ئەمجارە چەندت گرت .. هی منن

وتتچی ؟!

**وسۆ :**

دوێنێ چوار پێوە بوون

چاویان وەك

پشکۆی ناو .. ئاگردان

زیتە زیت

بریسك و هوڕیان بوو

پێشوەخت .. من قەولم پێدابوو

ناردمن بۆ کوێخا

« بەپێکەنینەوە »

دیارییەك بۆ مـاڵی کوێخا بێ
ئەی دیاریی تۆش نیـە ؟!

**پـیرۆت :**

« لە مام وسۆ دێتەپێشەوە »

مام وسـۆ .. گوێ بگرە
تۆخوا گەر گوێ نـەگری ..
گێژاوی ناو سەرم .. هەتابێ
تووڕەتر .. دەرۆنم لۆل ئـەدا ..

**وسـۆ :**

گوێم لێتـە .. گوێم لێتـە
ئـەزانم چی ئـەڵێی
باس .. باسی خاوەرە .. وا نیە ؟!
سـەیرئەبێ .. نەیزانم .. گێژاوی ئەو سـەرە
لەکوێدا .. ئـەبێتە .. تەتورە !

**پـیرۆت :**

مام وسۆ .. پێش پێی تۆ
لـە دڵما وام ئـەوت :
تۆ بڵێی کە کوێخا .. دوای ئەوەی
چوار سـاڵەم تـەواوکرد
بەڵێنی بشکێنێ و .. خاوەرم نەداتێ
تۆ بڵێی ئـەوەندە ناپیاوبێ !
ئەڵێی چی .. مام وسـۆ .. ئەڵێی چی ؟!

**وسـۆ :**

تۆ قسـەی سـەیرئەکەیت
چـۆن نایـدا ؟!

هەرچەندە •• نەگریـــە و •• چاوچنۆك
شـتی وا •• چۆن ئەکا
ئەی دەسـتی لەبەردەم مەلادا ••
نەخســته ســەر قورئان
پەڕوباڵ دەرئــەکا
رۆ ڕەشـــی بەر دەرگای خـــوا ئەبێ
چۆن شتی وا ئــەکا
تۆش نەڵێی بێکەسم •• ئێمە چین ؟! •• پیرۆت گیان
با دڵت خوتورەی وا نەکا !
ماڵخراپ •• ئای کە تۆش •• وەسواســـی
**پـیرۆت :**
ئەڵێم •• ئێ •• دنیایــە ••
دنیای واش •• تا ئیستە •• سوڕانی
بە دڵی وەك پیاوی کوێخایە !
**وســـۆ :**
لە ســـەر خوا •• تۆ جارێ
هێشتاکە •• لە کوێتــە !
سێ ساڵیت بڕیوە و •• چواری تر •• هەر ڕێتە
بڵێی چی •• ناچاری ئارامت بڕوێنی
ناوچـــەوان وای هێنــا
خـــوا نەیکرد خوشـکێکت بداتێو ،
تا وەکو ئەم خەڵکە تۆش بیدەی بە ژنێ
**« وچان »**

ئەزانم •• شوانکاریێ و شاخنشین
گرانە و •• نانەکەی هەتاکو دێتە چنگ

ئازاری .. وەك هەویر ئەتشێلێ
بەڵام تۆش هێشتاکە هەڕەتی لاویتەو
خۆ مادەم خاوەریش دڵی خۆی بەپاکێ
پێدا‌وی ..
کێی تره .. گاسنی بتوانێ .. دڵی ئەو بکێڵێ !

« وچان »

**پیرۆت :**

مام وسۆ .. ئەی توخوا .. خاوەر چۆن ،
کچێکە .. تۆ بیڵێ
هەر وەکو ئاسکە موبارەك وا نیە ؟!
بۆ پاکێ و بۆ جوانیش لەو ناکات ؟
نازانم .. مام وسۆ .. ئەڵێی چی ..
دڵی من بێ‌هیچیان هەڵناکات !

**وسۆ :**

ئۆباڵی .. قسەی خۆم بە گەردن
کچی وا .. رۆستور و . داوێنی وەها پاك ،
دەگمەنە .. وتەمە .. تا مردن
دەی رۆڵە .. ئاسکەموبارەك پیرۆزیی خۆی‌بدا
بە بەختی هەر دوکتان
هۆ پیرۆت نیزای من گیرایە
ئاسکەموبارەك .. پشت هەڵکا .. لە هەرکەس
خوا بەڵای لێ ئەدا
ئەوەتەی ئەو هەیە و ئەم دنیە
خێر بەسەر پیاوچاکا .. ئەبارێ‌و ،
دەرۆنمان بێ‌قۆرت و گرێیە !

پـیرۆت :

مام وســو •• دەی توخوا
بەو دەنـگە شیرینەت •• شتێکم لە بەیتی
ئاسکەموبارەك بۆ ناڵێی
نازانم •• لەو بەیتە تێر ئابم
تــا مابم !

وســو :

بەیتێکی درێژە •• ئەو جارەش پێم وتی
چەند جارێ ئەم گوندی خەزانەو ،
ئــەم خەڵــکەی ••
پاراست لە ، فەوتان و مردن و نغرۆبوّن ••
چی‌بڵێم ؟!

پـیرۆت :

دەی توخوا ، با دڵم هێندەی تر
بســوتێ و بڵێسەی باوەش‌کا
بەو دەنـگە خۆشەتا •• دەی توخوا

وســو :

**« دەست ئەخاتە پەناگوێی و تێ‌ئەچریکێنێ »**

بۆ بەیتی ئاسك ، ئاسکەموبارەك .. گوێ‌بکەن بە دڵ
دڵ‌بکەن بە گوێ ، ئاسك فریشتەی لای خوداوەندە
لە ئاسمانەوە هاتۆتە ناو دێ . هەور سەرێتی ،
هەتاو ڕەنگێتی ، ئەستێرە چاوی ، هاژە دەنگێتی ،
هەژاران خوێنی ، بەفر سەرینی ، لە کوێ گوڵ بڕوێ ،
لەوێ ئەیبینی ، بۆ بەیتی‌ئاسك ، عاشقان بابێن
وەکو خۆر هەڵبێن ، سەودایە و سەودا ، سۆزی
ئەم بەیتە ، پەنجەی گزنگە و ، گڕ لە تاریکێ خەزان ،
بەرئەدا ، خەزان ئەزانێ ، چۆن لە باوەشی درەختی

خۆیدا ، ئەو هەڵئەگرێت و لە کام ڕوباری
ئەوینی پاکیا ، دەم ئەنێتە دەم ، ئاسۆی برینی ...
« **بێدەنگئەبێ و ڕۆئەکاتەوە پیرۆت** » :
پیرۆت گیان .. ئەوەندەی بۆ ئەمڕۆ
درەنگمەو ، ڕەزەکەم تەنیایە
« **هەڵئەستێتە سەرپێ** »

**پیرۆت :**

مام وسۆ .. پێم وتی :
تینوێتیم لەو بەیتە قەت ناشکێ
بەر لەوەی کە بڕۆی .. پرسیارێ
ئاسکە موبارەك .. پێش‌وەخت ،
هەست ئەکا ؟!

**وسۆ :**

هەست‌ئەکا .. پێش‌وەخت .. هەست‌ئەکا
کەچی دێ و ڕۆئەدا :
دێتە ناو گوندەوە ماڵەوماڵ ئەکات و ،
باڕە بارێ .. بە چوار پەل
وەك لەسەر ژیلەمۆ وەستابێ
جێ‌ناگرێ بە خۆی و بازئەداو ڕائەکا
ئیتر گوند ئەزانێ بەڵایەك بەڕێوە ،
مل‌ئەنێ .. بۆ خەزان .

**پیرۆت :**

ژیانی ئەم دێیە .. مام وسۆ
لە چاوی ئەو دایە
بڕواکە .. مام وسۆ .. ئەو نەبێ
کوێرایی خەڵك دایە !

« زۆراب ـ بەپڕتاو بەرەولای هــەر دوکیان دێت و لــە دوورەوە هــاوار ئەکات » .

**زۆراب :**

هۆ .. مام وسو .. هۆ مام وسو
تەڵەکانت تەقــین و دوو ،
ڕێوی چاو زیتیان گرتــووە
یەکێکیانیش هەژگێکی بــە :
کلکی خۆیــەوە بەســتووە

**پـیرۆت :**

خــۆ ئەمجارە .. دیــارین بۆمن
نەیانبەخشــی

**وســو :**

« بە پەلە ئەڕوات و بەدەم ڕێوە ئەڵێ »
ئــای مام ڕێوی
خــۆی نەئەچوو .. بــە کونەوە
کەچی هەژگێکی بە کلکی
فیڵی خۆیــەوە بەستبوو
ئای مام ڕێوی !
وای مام ڕێوی !

**« تاریکی »**

## تابلۆی دووەم

« شانۆ ڕۆناك ئەكرێتەوە ، كۆرس بەگۆرانیەوە ، ئەم شـیعرە ئەڵێـن ، پێ بەپێی ئەو ئاوازەی دانـراوە ، دەرهێنـەر هەڵس وكەوتیـان ڕێك ئەخات ، شوێنەكانیان دیاری ئەكات »

**كۆرس :**

ڕۆژ ئەڕۆی .. شەو ئەڕۆی
پیرۆتی هەڵقرچاو لە كونی شمشاڵدا
ئاوازەی عەشقێكی لە زامدا باڵ گرتوی ،
بۆ خاوەر لێ ئـەدا .

**تاك لە ناو كۆرسەوە :**

ئاسكی پیرۆزیش ئەیزانی
ئەو عەشقەی كوڕە شـوان هەتابێ
لە رەزی ناو دڵی خاوەردا
هێشتوی گڕ بە پەلكی خوێنەوە جێ دێڵێ

**كۆرس :**

كوڕەشوان بە ڕێگەی بریندا
ڕەنجی خۆی كێش ئەكرد بۆ كوێخا
بەو مەرجەی قڕانێ وەرنەگرێ و ،
دوای حەوت ساڵ خاوەری پێ بدا .

**تاك لەناو كۆرسەوە :**

رۆژ ئەڕۆی .. شەو ئەڕۆی
ئاسكی ئەوینی ناو گیانی كوڕەشوان
هەناسەی ژۆژگاری ئەژماردو ،
فرمێسكی لە رۆی شەو ئەپژان .

**« تاریكی »**

« ڕۆناكی ، حیكایەتخوان دێتەوە سەر شانۆ »

**حیكایەتخوان :** « لەناو چەپكە تیشكێكدا »

پایز هەر لە قژی درەختی ئەڕنی و ،
ئەیدایە .. دەستی چەم
چەم ئەڕۆی .. دەسكەنەی ئەو قژەی
بە زەریا دوورەكان ئەگەیان
پایز هەر لە گوندی خەزاندا
دەواری كزەبای بەفرینی هەڵئەداو ،
كزەباش .. هەناسەی ئاسك و شوانەكەی
سەر چیای
بە دەستی رەشەبا سوورەكان ئەگەیان .

**« وچان »**

هەواڵی .. ئاسكە موبارەك
گەیشتە خوار پێدەشت
هەواڵی ئەوینی خاوەر و كوڕە شوان
تا ئەهات ..
پەلوپۆی بە دەوری ئاوایی و ،
گشتلادا ئەهاویشت
مام وسوی رەزەوان چەند رۆژێ

پێش ئێستە ٠٠
لەسەر ڕێی ڕاوکردن بە کوێخا ٠٠ کە گەیشت
پیرۆتی دڵداری هاتەوە بە بیردا
بەڵێنی خستەوە بیر کوێخا
وای پێ وت :

**« ئەڕوات »**

« هەمۆ شانۆکە ڕۆناك ئەکرێتەوە ، دیمەن سەرە ڕێیە ، مام وسۆ بە کوێخا ئەگات »

**وسۆ :**

ماندۆنەبی ٠٠ کوێخا بایز ٠٠ ماندۆنەبی
دەس ڕەنگینبی و ٠٠ نێچیرت قەڵەوبێ ٠٠

**کوێخا :**

ئەی بەرخورداربی ٠٠ مام وسۆ
ئەی تۆ چۆنی ؟ ڕێوییەکانت لە چیدان ؟

**وسۆ :**

نابڕێنەوە ٠٠ کوێخا بایز ٠٠ نابڕێنەوە
بەلام منیش چاك قڕم تێخستوون
گەر وانەکەم ٠٠ بڕوا بکە
وێرانی ئەکەن ڕەزەکەم ٠

**کوێخا :**

بیرم نەبۆ ٠٠
ئەمساڵ چەندت کردووە بۆ حەیوانەکان ؟

**وسۆ :**

وەڵلا کوێخا ٠٠ دۆ « دێم » لە پار
زیاترە و هێشتا هەر دڵم

داقامرکێ !

**کوێخا :**

بـــۆ مام وســـۆ بۆ ؟!

**وســـۆ :**

کوێخا بایز •• ئەترسم زستانی ئەمساڵ
ســـەختتر و دژوارتربێ لە هی پار

**کوێخا :**

نا •• مام وســـۆ •• مەقرێنە !

**وســـۆ :**

کوێخا گوێ بـــەینێ باشـــترە
زســـتان وەك مار بێ ئامانـــە

**کوێخا :**

تۆ وازبێنە لەم قســـانە
من دوو ڕۆژە چاو ئەگێڕم
بۆ ئاسکەکە و •• نایبینمەوە
دیار نەماوە !

**وســـۆ :**

کوێخا بایز : خوانەکا ••• خوانەکا دیارنەبێ
من بەردەوام هەر ئەیبینم
بەڵام ئەوە چەند ڕۆژێکە خۆی داوەتە
بەر ئەشکەوتی میری میران
لەوەڕگەی ئەو ناوە بژوێنە

« کەمێك بێدەنگ ئەبێت و لائەداتە سەر باسێکی تر »

کوێخا بایز •• وا بزانم •• لەو کاتەوە

که پیرۆتت کردۆته شوان
گورگ پارێزی له رانه‌مه‌ڕ
لێ‌تێك‌چـوه‌و ،
ئه‌مساڵ له کوێ له‌گه‌ڵ ساڵان

**کوێخا :**
راسته وایه : به‌ڵام پیرۆت ماوه‌یه‌که
زیاد له جاران .. خۆی داوه‌ته
شمشـاڵ لێـدان
ئه‌ترسم غافڵ‌بێ و مه‌ڕه‌کان
زیانیـان لێ‌که‌وێ .

**وسـۆ :**
نه ئینشه‌ڵلا .. پیرۆت زیته و ئاگام لێیه
سه‌ر به سـه‌ر
وه‌ك چاوی خۆی ئه‌پارێزێ رانه‌مه‌ڕ
کوێخا بایز جگه له‌وه‌ش ،
ئه‌و به‌ڵێنی به تۆ داوه و
تۆش به‌ڵێن بـه‌و

**کوێخا :**
له به‌ڵێنم په‌شیمان‌نیم
بـه‌ڵام من هه‌ر زۆ وتومـه
ئه‌بێ ئه‌ویش شوانکاریبه‌که‌ی وه‌ها بکا
مـن رازیکا
جارێ هێشتا ئه‌ویش چوارساڵ
رێی له‌به‌ره‌و .. خوا ئه‌زانێ چیمان لێ دێ !

**(( به ده‌نگێکی نزم‌تر ))**

من حەزناکەم •• وا حەزئەکەم
تۆ پێی بڵێ ••
خۆ هەرچەندە •• هیچ نەبووە
بەڵام ئەویش با ئەوەندە لەم‌لاو لەولا
بەڵای قسەمان لێ‌لادا
خۆت ئەزانی و دنیا دیتەی
هێشتا پیرۆت لە کوێیەتی و چی‌کردووە !

« ( پیرباڵ )ی ئاشەوان لەو بەرەوە ئەڕوات ، کوێخا بانگی‌ئەکات »

**کوێخا :**

هۆ •• هۆ •• پیربـــاڵ
لادە ئێرە

**پیرباڵ :**

« دوای ئەوەی ئەگاتە لایان »
فەرمو کوێخا منت بانگ‌کرد ؟!
مام وسۆ گیان •• حاڵ و ئەحواڵ
شـــوکورباشـــی •••• « لائەگاتەوە »

**وســـۆ :**

خوا دەس بە باڵتەوە بگرێ

**کوێخا :**

ئەوە بۆ کوێ وا بە پەلە
خۆ ئاشەکە باش ئەگەڕێ ؟

**پیرباڵ :**

وەڵڵا کوێخا •• سا ئیتر وا بە لەقەلەق
ئێمەش لەگەڵ پیرەئاشدا کوتاومانە

ئەوە وتیان کاروان لە شار هاتۆتەوە
ئەچم حەمەی سەر قەتارچێ ببینم •• تا ••
کوێخا : « قسەکەی پێ ئەبڕێت »
حەمە ؟! حەمە بۆچی ؟!

**پیرباڵ :**
بەخوا •• ئاوا بەر لە مانگێك
پارەم دایە •• ئەگەر هات و ڕێی کەوتە شار
متومۆرۆم بۆ بهێنێ

**وســۆ :**
« بەسەرسوڕمانەوە »
متومۆرۆ ؟!

**کوێخا :**
متومۆرۆ ؟ تۆ متومۆورۆت بۆ چییە ؟!
کچت هەیە ! بۆ پیرێژن ؟!
ئەی خۆ نــاشێ
تازە سمێڵ قیتکەیتەوەو ••
خۆتمان لێکەیت بە کوڕێکی چواردە ساڵ
مرخ لە ژن خۆشکەیتەوە

**پیرباڵ :**
نەوەڵلا •• بابە •• من و ژن
مەیمۆن خۆی لە خۆیدا جوانبۆ
بەڵام ئاوڵەشی دەردا
نە بابە •• نە •• پیرێژنیش تازە لەڕێی
چیدامــاوە !

**« بیرئەکاتەوە »**

**وسـتۆ :**

ئەی کەواتە مت‌ومتۆرو

ئا •• ئا •• زانیم •• زانیم  **« بیرئەکاتــەوە »**

**کوێخا :**

چیت زانی •• هــا ؟!

**پیرباڵ :**

راستێکەی ئەوەیە •• من نەزرم لە سەر بۆ

مت‌ومتۆرۆ بهۆنمەوە و •• بیکەمە مل

ئاسکەموبارەك •• ئێستاکە زانیتان ؟!

**وسـتۆ :**

من وتم ئەیزانــم

تا بڵێی نەزرێکی پیرۆز و پەسندە

**کوێخا :**

بێقەزابی •• وتم ئــاخۆ

راسپاردەی چیت‌کردووە

مت‌ومتۆرۆ لە گەردنی ئاسك‌بکرێ و نەکرێ ئەبێ

جێگەی کام شتت بۆ بگرێ

هەی ماڵشێواو •• راسپاردەی

پۆشێ خورمات بکردایە •• چاکتر نەبۆ

ئێمەش یەك دۆ دەنکمان بەرکەوتایە

چاکترنەبۆ •• هەی ماڵشێواو !

**وسـتۆ :**

نەء ! •• کوێخا •• نەء ! چۆن وا ئەڵێی

ئەو دیارییەی بۆ ئاسکەموبارەك بێ

موفەڕکێکە ئەبێ لەسەر ، سەر راگیرێ‌و ،

مـــاچیش بکرێ
تۆزێ وەفا •• کویخا بایز •• تۆزێ وەفا

**کوێخـــا :**

دیسانەوە هاتینەوە سەر ئاسکەکە
چەند نەگبەتن ••
بەسە •• بەسە وا بـــاشترە
ئەم بـــاسە بگۆڕیـــن
ماڵتان شێوێ لە بیرتان بردمەوە
مـــن ویستم چی بڵێم

**پیربال :**

کوێخا دەی •• ئێ •• فەرمۆ
هیچ کارت بـــە من بـــۆ

**کوێخـــا :**

سبەی شەوێ •• نۆبە دەستاڕ
بۆ ماڵی ئێمەیە و •• هەمۆ شت ئامادە و
چاوەڕێین کچ گەل و کوڕ گەلی ئاوایی
بگەنە لامان و دەس پێ بکا دەستاڕ هێڕی
تۆ •• ماموستۆ •• مەنیج گورجە و
تۆش پیربال گیان •• هەر لە ڕێوە
حەمەی دارکەن ئـــاگادار کە
بیری نەچێ •• خۆی بێ
یاخود سوارەی ئەولامان بۆ بنێرێ
لەدوای ئێمەش نۆبە دەستاڕ لەکوێی تر بێ
بـــانگ هەڵدێریـــن

ماڵ لە دوای ماڵ ئەیڕەخسێنین
چاوەکەمن .. بیرتان نەچێ

**پیربال :**

کوێخا بایز . هەمۆ ساڵێ وانەبووە ؟!
بیرمـــان ناچێ

**وســۆ :**

منیش مەنیج و گوڵچینتان بۆ ئەنێرم

**« تاریکی »**

## تابلۆی سێیەم

**« ڕۆناکی کۆرس »**

**کۆرس :**

پایزە و لێوانی دێی خەزان
وەك کولمی خاوەری گوڵگرتوی
بەر سەرمــا ئەلەرزن
قژی ڕەش شۆڕەبی ناو چەمی شەوانە

**کوڕێکیان :**

جۆتە مەم •• دوو بێچوە کەروێشکی ،
سپیلکەی ڕەزەکەی مام وسوون
لە خشپەی سەر پەنجەی کێویلەی
کوڕە شوان ئەترســن

**کۆرس :**

پایزە و ئاسکەکەی سەر چیــا
چیرۆکی میوانی ناو هەمو
ژوورێکی مــاڵانە
کوژەکەی گۆشەدار لە ملیــا
ئەستێرەی ناو خەوی دێرینی ئاسمانە

پایزە و وەك گشت ساڵ
وا ئەمشەو کچ و کوڕ ، دڵداران
لە مـــاڵی کوێخادا
دوو بە دوو قسەی دڵ لەترسی پێزانین
ونئەکەن لە هاژەی دەستاڕدا

**کوڕێکیان :**

ئای ئەمشەو بۆ گیانی کوڕەشوان
ئەبێ چۆن لە عەشقی خاوەردا
گڕبگرێ تـــا .. هەڵســـان

**کچێکیان :**

ئای ئەمشەو بۆ خاوەر
ئەبێ چۆن ئارەزووی چاو ببڕێ
لە سنگی توکنی کوڕە شوان

**کۆرس :**

دڵداران ئەزانن کە ئەمشەو
لای کوێخا و کوێخاژن .. هەر هاڕین مەبەستە
نازانن کە دەستی دڵداران
شل نابێ و جێژوان
بۆ ئەوین هەر کوێ بێ بەهەشتە .

**« تاریکی »**

« شوێن بە شەوقی فوتیلکەیەك روناك بۆتەوە ، دیمـــەن ژوورێـــکی مـــاڵی کوێخایە ، نۆبە دەستاڕهێڕی ئەوانە ، پیرۆت و خاوەریش ئـــەم شەوەیان بۆ رەخســـاوە و لەسەر یەك دەستاڕن و بەرامبەری یەك دانیشتون ، لەم دیمەنەدا، ئەتوانرێ ، پیرۆت و خاوەر و دوو دەســـتـــاڕهێڕی تر نیشـــانبدرێ و ئـــەوانی تریشیان لە ڕێگەی دەنگەوە بناسرێن » .

**دەنگی کوێخــا :**

کوڕینە •• قوربانی ئەو دەست و مەچەکەی ،
ئێوەبم •• بهــاڕن
بهــاڕن •• مەسرەون
هەتاکو دوا دەنگی ناو جەواڵ وردئەبێ
کوڕینە قوربانی بازۆتان
بهاڕن دەرفەتە
کوا ئەمشەو بۆ خەوە !
با دڵی کوێخاتان رازیکەن
ســاڵێکە و ئەم شەوە
دەرفەتــە

**پـیرۆت :**

« هەر بەدەم هاڕینەوە »
دەرفەتە •• خاوەر گیــان •• دەرفەتــە
ئەو چاوە رەشانەت هەڵبڕە و
بڕوانە •• سۆتانی ناو دڵم ••
بمدوێنە •• خاوەر گیان •• بمدوێنە
هۆ گیانم •• هۆ ژینم •• هۆ گوڵم

**دەنــگی کوێخــا ژن :**

کچینە •• قوربانی ئەو شان و باڵەتان
شان و بــاڵ نەڕزێ
گوڵینە •• قوربانی ئەو پەلکە ناسکەی
پەنجەتان ، کە ئەمشەو وا لەگەڵ
هاڕیندا ئەلەرزێ
کچینە •• دەی دڵی کوێخا ژن رازیکەن

کچینە مرادتان حاسڵ بێ و ،
بە هیوای خۆبگەن

**خـاوەر :**

ئاخ خۆزگە هەمو کەس بە مراد ئەگەیی
ئاخ خۆزگە هیچ گوڵێ ژاکانی نەئەدی

**پـیرۆت :**

خاوەر گیان .. بە هیوای خوا .. هیوام رۆشنە
شوانکاریم ئازاری چەند زۆربێ
لەبەر تۆ خاوەرگیان .. لەبەرتۆ
لە لای من وەك خۆشاو چێشتنە ..
پشت بە خوا هەر ئەبێ ساڵانی بەردەمم
تەختکەم
ئاکامیش خاوەرگیــان ..
پێت بگەم .. پێت بگەم

**خـاوەر :**

ئای پیرۆت کە چوار ساڵ
رێگەکەی درێژە و ، هەر شەوەی
چقڵێکە و .. لە ئارام ئەچەقن
ئای پیرۆت .. چۆن بڕواو بە سەرچێ
چۆن پیرۆت ؟!

**پـیرۆت :**

خاوەر گیان .. قەتنەکەی
توخوا گەر بهێڵی .. دڵی خۆت
تاریكکەی ..

«ئاورێك ئەداتەوە و دەس ئەخاتە سەر دەستی»

**خـــاوەر :**

وا مەکە ‥ ئەترسم

نەك چاویان لێمان بێ

« پیرۆت کە دەنگی کوێخا ئەبیستێ دەستی دەستی لەسەر دەستی خاوەر لائەبا »

**دەنگی کوێخـــا :**

قوربـــانی چاوتانم

هۆ کوڕگەل ‥ سستنەبن ‥ بهاڕن

بە تەمای مەچەك و قۆڵتانم

**پـــیرۆت :**

بە تەمای هاتنت ‥ خاوەر گیان

دوێنێکە لەنـــاو رەز

هەتاکو درەنگان

تا « مشتاغ » هەلگرتن

چاوانم لەسەر رێ نەتروکان

ئەی بۆچی خاوەر گیان دیار نەبوی

خۆ باوکت لە راو بو ؟!

**خـــاوەر :**

لە دورە ‥ دەشتەوە

میوانمان هاتبو

بەڵام من ‥ هەر دڵم ‥ لەلات بو

**دەنگی کوێخاژن :**

ئەی دەستە کچانی ڕوسور و پاکی دێ

کوێخا ژن لە دەوری ئەو شان و قۆڵەتان

بگەڕێ ‥

سست مەبن ‥ بهـــاڕن

کوێخاژن زەنگیانە و مۆروتان
بۆ بەینی مێخەکبەند ئەداتێ

**پـیرۆت :**

ئەمجارە •• خاوەرگیان •• ئەمجارە
هەر بچمە کاروان و بگەمە قەیسەرێ
من مۆرووی مەرجانتان بۆ دێنم !
کام گوارەی شۆڕابە و موستیلەی بە ورشەی ،
جوان هەیە من ئەوەت بۆ دێنم

**خـاوەر :**

« بەسەرسوڕمانەوە ، دەس لە دەستاڕەکە بەرئەدا »
وتت چی ؟! من مۆرۆی مەرجانتان
بۆ دێنـم ••
من چەندم •• هەر خۆم نیم ؟!

**پیرۆت :** « بەپێکەنینەوە »
خاوەر گیان هەر دۆکتان !

**خـاوەر :**

هەر دۆکمان ؟! ئای پیرۆت ئەڵێی چی
نازانم •• ئەڵێی چی ؟!

**پیرۆت :** « بەپێکەنینەوە »
خاوەر گیان •• تۆ ئەوی و ئەویش تۆ
هەر دۆکتان بۆ دڵی کوڕە شوان
خوێنێکن ، خاوەر گیـان !

**خـاوەر :**

نازانم •• نازانم ئەڵێی چی •• نازانم
تۆ گاڵتەم پێئەکەیت ؟!

**پیرۆت :**
نەبەخوا •• بەو چاوە جوانانە
راستئەکەم هەر دۆکتان !
**خـاوەر :** « بەتورەبونەوە »
سا بەخوا لێرەوە هەڵئەستم
پێم نەڵێی ؟!
**پیرۆت :**
پەستمەبە •• گیانی من •• پەستمەبە
کچانی ناو خەزان لەلایەك
خاوەریش بەتەنیـا لەلایەك
لای ئەوان دەرۆنی برایم داناوە
لەلای تۆش هەناوی ئەوینم داناوە
تۆ نەبی چیمداوە •• لەو ژینەی ،
هەمو رۆژ تاڵاوی بە قورگما کراوە ••
« بەپێکەنینـەوە »
پەستمەبە •• کە وتم هەر دۆکتان
ئەویتر ئاسکەکەی پیرۆزی چیایە
ئەی توخوا خاوەرگیان ، ملوانکەش
وەکو تۆ •• لەو نـایە ؟!
**خـاوەر :**
« دوای دڵنیابون »
دە پیرۆت وا بڵێ •• وا بڵێ
ئەو ئاسکە پیرۆزە
نەوەك هەر بە مورو هەق وایە
ملوانکەی بۆبکرێ

هەق وایە خەڵکی دێ
ــ سەرکەلەی ــ زێڕینی بۆبکرێ

**پیرۆت :**

من ناڵێم •• خاوەر گیان •• من ناڵێم
هەر بچمە کاروان و بگەمە قەیسەرێ ••
« قسەکەی تەواوناکات کە کوێخا بانگئەکات »

**دەنــگی کوێخــا :**

کوڕینە •• کچینە •• بهاڕن
هێشتاکە جەواڵمان هەر پڕن
هۆ سوارە •• هۆ مەنیج
چەند « کۆتك » هاڕڕاوە ؟!

**دەنگی سوارە :**

کوێخا گیان •• وچانمان نەداوە
هێندنەبێ •• ئارەقمان سڕیوە
ئەوەندەی حەز ئەکەی
ئەوەندەش کۆتکمان هاڕیوە

**دەنــگی کوێخــا :**

با بازوی دەستاڕهێڕ هەر خۆش بێ
قوربانی چاوتان بم بهاڕن
سستمەبن ، سستمەبن
وا من و کوێخاژن خەریکی ترێی ناو ،
قوڵینە و بەرچنەین
هەر دەسمان بەتاڵ بێ
سەرێکتان لێئەدەیــن

**« وچان »**

**پیرۆت :**

خەو •• سەیرە

ئەزانی خاوەر گیان •• دوێنێ شەو لە خەوما

چیم‌بینی ؟!

**خـاوەر :**

خوا بەخێری بگێڕێ

**پیرۆت :**

لە شوێنێ وەك لەوبەر سیروان‌بم ئاوەها

تۆ بوك بۆیت بە سواری هاتیت و ،

دامگرتی

کە تارام لەسەر سەر لابردی

خاوەر گیان ! خاڵەکەی سەر گۆنەت

لەپڕ بو بە هەنگ و هەڵفڕی

خەو سەیرە •• خاڵ بفڕێ •• خەو سەیرە

دوای ئەوە خاوەر گیان ••

**خـاوەر :**

« قسەکەی پێ ئەبڕێ »

خەبەرت •• بووەوە ؟!

**پیرۆت :**

نا •• نا •• نا •• لە خەومـا

ئنجا هەر ئەوەندەی پێ نەچـو

ئاسمانی سەر سەرمان ئەیگرمان

رەنگی زەرد هەڵگەڕاو ،

بەفرێکی •• سور باری

خەو سەیرە •• بەفری سوور •• خەو سەیرە
دوای ئەوەش خاوەر گیان ••

**خــاوەر :**

ئەمیشیان لە خەوا ؟!

**پیرۆت :**

ئا •• ئا •• ئا •• دوای ئەوەش لە خەوما
توترکێ ئاڵابوو لە سنگم
چەندم کرد کە بە دەس رایکێشم
توترک بەر نەبوو لە سنگم
لە پڕدا داچڵەکیم • کە هەستام
ئەزانی چیم بینی •• ئەزانی
« قاقا دەست ئەکات بە پێکەنین »
ئەبینم •• بە راستی
وا مشکێ هاتوتە سەر سنگم
« پێکەوە دەس ئەکەن بەپێکەنین »

« وچان »

**خــاوەر :**

تۆ مەلاش ببینە ••
خەونامەی مەلای رەش هەر نییە ••
ئەوەندە پیرۆزە ••
خێرئەبێ •• خێرئەبێ
لە خەوا •• خاڵ بفڕێ و ،
بەفری سوور بباری

« وچان »

**دەنــگی کوێخــا :**

هۆ •• پیرۆت

**پیرۆت :**

« وەك داچڵەکێ »

هۆ بەڵێ •• هۆ بەڵێ

**دەنگی کوێخــا :**

ئەوە بۆ •• بێدەنگی ، دەستاڕهێڕ

با تاقەت پەیداکەن

با نەڵێن لە نۆبەی ئەواندا

کۆڕ سارد بو ••

حەیرانێ •• دەی پیرۆت •• حەیرانێ

**دەنــگێ :**

بەساقەی چاوت بم

ئا •• ئا •• دەی حەیرانێ

**پیرۆت :**

بە چاوان کوێخا گیان بە چاوان

هەر ئیستە ، تۆ و حەیران ؟!

**خــاوەر :** « بەدەم زەردەخەنەوە »

بە دڵی •• خۆت بیڵێ

ئەوەبێ •• جارەکە •• لە ناو رەز

بۆت وتم !

**پیرۆت :**

« ئامادەئەبێ و دەستئەکا بە وتنی ئەم حەیرانە ، کە کتومت وتەکانی لە حەیرانی ئەسڵییەوە وەرگیراوە » .

« حەیران •• حەیرانە •• حەیرانی لێ دێ

بەژنی نازدار حەیرانێم •• چەندە بڵندە ،
کەمەرەی لێ دێ
دەستی من دامێنی ئەوان وەستاو وەستاکاران بێ
کەمەرەیەکی دروستبکەن بۆ نازدار حەیرانێ
نەگرن بە گازێ لێنەدەن بە چەکوچێ
لەسەر دەستی خۆیان دابنێن لە مابینی عەرد و عاسمانان
بەڵکە باری تەعالا •• بە قودرەتی خۆی
دادەڕژێنێ کەمەرێ ، ئەوجا نازدار حەیرانەکەی من
شلك •• شلك •• تەنك •• تەنك
بیبەستێ و پێی بێتەوە جێژوانێ
کچ وتی : گەلی دەستە خوشکان ئەنگۆ خەبەرێکی لۆ من
بدەنە کوڕەتیم •• حەیرانێ •• بمگاتێ
داخوازیکەری من هاتینە بابێکی گەلێ بێدینم هەیە
زۆر دەترسم بمداتن
کوڕەتیم حەیرانێ دەڵێ : ئەنگۆ جوابێکی بدەنە
نازدار حەیرانێ ، سەبرێکم لێبگرێ
شەرت بێ لەو بەندەی دەربێنم
یان بە ماڵی دنیایە
یان بە زەبری خەنجەرێ »

« هەر کە کوڕە شوان لە وتنی حەیرانەکە ئەبێتەوە یەك دوو دەنگ لـەم لاو لەو لاوە بەرز دەبنەوە » .

**دەنگی یەکەم :**

ئەی دەنگت نەڕزێ •• کوڕە شوان
بو خۆت و حەیرانت ••
بە هیوای خۆت بگەیت

کوێر نەبێ چاوانت

**دەنگی دووەم :**

ئەی دەمخۆش

ئەی هەزار رەحمەتیش

لە گۆڕی مردووت بێ

وەك ئاوا دەمارت بزواندین

**دەنـگی کوێخـا :**

هەی دەمخۆش .. هەی دەمخۆش

ئاوەها .. باتینی ماسولکەی دەستاڕهێڕ

گوڕبدا .. بە جەستە و سستنەبێ ..

**خـاوەر :** « بە دڵێکی خۆشەوە »

قەت دەنگت نەڕزێ

هەمووی هەر بۆ من بێ

وا نیـــە ؟!

**پیرۆت :**

خاوەر گیان .. تا چاوتان .. دیاربێ لێم

تۆ و ئاسکە موبارەك

من دەنگم وەك سەرم بڵندە

تۆ بڵێ و هەر بڵێ

ئەوینمان نەڕزێ .. خاوەر گیان

ئەوینمـــان !

**« وچان »**

« پیرۆت .. بە وردی ئەڕوانێتە چاو و گەردن و سنگ و مەمکی خاوەر و دەست ئەخاتە سەر دەستی » .

**خـاوەر :**

بۆ وەها ئەڕوانی

ئەڵێی قەت نەتدیوم

**پیرۆت :**

ئاخ خۆزگە ئیستاکە

ناو باخ و ڕەز بوایە

ئەوساکە ئەمزانی !

**خـاوەر :**

لەبەرچی ؟!

**پیرۆت :**

تێر •• تێر •• تێر

ئەو خاڵ و گەردنەم ئەمژێ

**خـاوەر :**

« بەشەرمکردنەوە »

سوك •• سوك •• سوك بدوێ

نەء •• نەء •• نەء •• ئەڵێی چی ؟!

**« وچان »**

**پیرۆت :**

« بە دەنگێکی بەرز بانگ ئەکات »

هۆ •• سوارە •• سوارە گیان

**دەنگی سوارە :**

پیرۆت گیان •• ئەڵێی چی ؟!

**پیرۆت :**

خۆ بیرت‌نەچووە •• وەختێتی

چارێکی ئەو ئێسك‌گرانەم بۆ ناکەی

هەتاکەی ؟! وەختێتی

**دەنگی سوارە :**

لە منت نەکەویّ .. لە بیرچوّن !
راوەستە بزانە هەناسەی لیّنابڕم
بوّ هەر توّی پەریّشان ؟!
توّ ئاگات لیّم نیە .. پارچەیەك ئاگرم

**پیروّت :**

چوّزانم ؟! وتم نــەك لە بیری کردبیّ

**دەنگی سوارە :**

دەرفەتە و .. دەرفەتیش زوّر تەنگە
دەستوبرد ..

**پیروّت :**

کەیە .. کەی ؟!

**دەنگی سوارە :**

دوای چوار پیّنج مشت هاڕین
ئەڵیّی چی ؟!

**پیروّت :**

زوّر چاکە .. زوّر چاکە
چاوەڕیّم .. خیّراکە ..

**خــاوەر :**

« تیّناگات »
چیتانە توّ و سوارە
ئەڵیّن چی ؟!
ئەو ئیّسك گرانە .. کیّیە .. کیّ ؟!

**پیروّت :**

« بە دەنگیّکی نزم و سەر ئەباتە پیّشترەوە »

خاوەر گیان ‥ ئەڵێین چی !
حەزئەکەین هەر قەیرێ
تاریکی دەرفەت با ‥

« لەم کاتەدا ، شتێك ئەگیرێتە قوتیلکەکە و ئەکوژێتەوە و شانۆ تاریك ئەبێ » .

دەنگی خاوەر لە تاریکیدا :
ئەمەندەش فێڵبازی ؟!

## تابلۆی چووارەم

« شانۆ ڕوناكئەكرێتەوە ، كۆرس ئامادەیە »

**كۆرس :**

ئەو تۆزە دەرفەتەی تاریكێ
دای بە ژۆر بۆ دڵدار
نەیداوە هەزاران قوتیلكە و نەیداوە .
هەتاوی زۆر ڕۆژگار
لە ماڵی كوێخادا
هەتاكو بەربەیان پرچی خۆی شانەكرد
كچ و كوڕ نیگایان وەكو مۆم
لە بەر دڵ ڕائەگرت

**تاك لەناو كۆرسەوە :**

ئەو شەوە شەوێ بێ بۆ دڵخواز
ئەبێتە خەیاڵێ كە زۆر جار
پێش مردن بەسەردان بیكاتە هەوارێ
بۆ ئاخی یـــادگار

**كۆرس :**

ئەی شەوی كۆتایی پاییزی
گرمۆڵەی بەر سەرما

با گڕی عەشقەکەی
پیرۆت و خاوەرت پیابدەین
بەر لەوەی کە بمری

« تاریکی »

« ڕوناکی ، حیکایەتخوان دێتەوە سەر شانۆ »

**حیکایەتخوان :**

خەریکە بە سەرچێ عومری وەرز
درەختی تێکڕژاو
وا دەستیان لێکبەردا
بارانە پایزەی کەم دەوام
بەبۆنی خۆڵەوە .. دڵۆپی درشتی
وەك گوڵاو هەڵپژا
باڵندەی کێویلە .. لە کونی شاخەوە
گوێی ترسی .. بۆ هاژەی
چەمی خوڕ هەڵئەخا
دوو چاوی پچکۆلــەی
لە ئاستی باوبژا
ئەتروکێ و ئەنوقێ و .. سەری خۆی
لە پەڕی ناو باڵدا ونئەکا

« وچان »

ئیستاکە .. جێکۆڕی هەروەز خاڵییە ،
چۆڵە وەك سەر سەکۆی بەر ماڵان
گەڵاکان .. سەمایان لە سەر ئاو
سڵاوی دوا کۆچە
کە ئەیکا لە خەڵکی دێی خەزان

« وچان »

ئاسکەکەی خەزانیش بە بازی ئەم بەرد و ئەو بەردی
سەر چیای ، راوکەری وێڵ ئەکرد
بە لەرەی ناو بازەی
هەتاکو ئیستەکەش ·· ئەو بانگی
ئازیز و دڵداری خێڵ ئەکا
ملوانکەی بەر سنگی زۆرترن لە دوێنێ
ماچ کەری خاڵی سەر تەوێڵی ·· تاکو بێ
لە ریزی چڕتردا
ئەڕۆن و ئەچنە پێش
بۆ ئەوەی خوێن بەن و ·
ماچێکیان بەرکەوێ

« وچان »

تا دوێنێ وا ئەڕۆی ·· ئاسایی ژیانی دێی خەزان
وا ئەمڕۆش هەواڵێ وەك بۆمەلەرزەیەك
ئەم گوندەی لەبەریەك هەڵتەکان
هەواڵێ ·· دەرونی خەڵکی دێی
لە بنج و بێخەوە ·· ڕاچەنان ··

« تاریکی »

« شانۆ رۆناك ئەکرێتەوە . دیمەن نــاو ئاوایــە ، پیرۆت بــە پڕ تاو و شپرزەییەکی زۆرەوە خۆی ئەکا بەناو گوندا و ، هاوار ئەکات » .

**پیرۆت :**

هۆ ·· هۆ ·· هۆ ·· ئاوایێ
هۆ کوێخا ·· مام وستۆ
پیابگەن ·· پیابگەن
زۆ ·· زۆ ·· زۆ

« لەبەرخۆیەوە و بە دەنگێکی نزمی پڕ لە داخ و گریاناوی » .

ستەمە •• ستەمە و جەخاریش
چۆن وابێ ؟! سەرەتای زستانێ دیاریدا
ئەو دڵەی گوڵێکی تیــا روابێ
بەبێ ئەو ناتوانێ هەڵبکا
ستەمە و •• نازانم چۆن چۆنی گەیشتە
ئەو جێیە ؟! نازانم •• نازانم

**« وچان »**

گەلێ جار •• چاوی ئەو •• مەڕانەم بینیوە
کە چەقۆ ئەبینن ، قەت بە قەد
چاوی ئەم •• کڵپەم وا تیا نەدین
خوایە گیان •• قودرەتت •• بخەکار •• قودرەتت
ناتوانێ •• ناتوانێ •• ناتوانێ

**« وچان ، هاوار ئەکاتەوە »**

هۆ کوێخا •• مام وســو
هۆ سوارە •• وان لە کوێ
وان لە کوێ ؟!

« کوێخا و مام وسۆ کۆمەڵە خەڵکێ بەپەلە دێن و ئەگەنە لای »

**کوێخــا :**

« بە پەشۆکاوییەوە »
خێرە •• خێر ! چیبووە ؟! چیبووە ؟!
چی رویدا ؟!

**مامۆوســۆ :** « بە شپرزەییەکی زۆرەوە »

خوا هاوار •• خێربێ خێر •• چیبووە

**پیرۆت :**

« بە نائومیدییـــەوە »

چی نەبێ !

**وســـۆ :**

بۆ •• بۆ ؟ !

**پیرۆت :**

فریای کەوین •• فریای ئاسکە موبارەك

فریای کەوین •• فریا ••

هەمۆیان بەیەك دەنگ : بۆچی •• بۆ ؟!

**پیرۆت :**

وا لەسەر ترۆپکی رەوەزدا

عاسییە و •• گیر •• گیری خواردووە

ئەی گوێتان لە بارە و ناڵینی ئەو نییە ؟!

چۆن گوێتان لێ نییـــە ؟!

**کوێخـــا :**

ترۆپکی کام رەوەز ؟!

کام رەوەز ؟!

**پیرۆت :**

ترۆپکی رەوەزی قەلەڕەش

**هەمۆیان بەیەك دەنگ :**

ترۆپکی رەوەزی قەلەڕەش

« کۆمەڵە خەڵکەکە بڵاوئەبنەوە بۆ هەواڵگەیاندن »

**وســـۆ :**

دەك کوێربم ! لەویانە ؟!

لە هەرجێ گیربوایەو ،

ترۆپکی رەوەزی قـــەلەڕەش نەبوایە

هەر ئەوێ نەبوایـــە

**کوێخـا :**

هەر ئەوێ نەبوایــە
قسەی هەر لێ ئەکرا
هەوڵێکی بۆ ئەدرا ..
هەر ئەوێ نەبوایە

**پیرۆت :**

ستەمــە .. ستەمە و جەخاریش
دوور بە دوور هەتاکو درەنگان
هەر چاوم تێبڕی و نیزامکرد
باڕژنی بەردئەکا بە ئاو و
چاوانی بونەتە دوو کڵپە ئەسوتێن
ئا .. ئا .. ئا .. ئەسوتێن
لە تاوا خەریکە باڵبگرێ
بەڵام چۆن باڵئەگرێ .. بێباڵە .. بێباڵە

**وســۆ :**

دەك کوێربم بە تەنیا باڵندە
ئەتوانێ لەو جێیە قوتاربێ
بە تەنیا باڵندە .. ئەی داخی گرانم

**کوێخـا :**

« بێبابەخانە و بە ساردییەکەوە »
پێش سێ ساڵ بزنێکم ڕێی کەوتە
هەمان شوێن .. ڕەوەزی قەلەڕەش

**پیرۆت :**

« قسەکەی پێ ئەبڕێ »
ئێ .. ئێ .. ئەی .. ئەنجامی .. ئەی دوایی ؟!

**کوێخـا :**

چی ئەکەیت ؟ دەسەڵات کە نەبێ
هەڵدێرە و بۆ خەرەند کەوتەخوار

**پیرۆت :**

ستەمە •• ستەمە •• مام وسۆ
بەڵام ئەم ئاسکە و ئاسکەموبارەك
ئەم بەڵا لادەری گشت دێیە

**وسـۆ :**

ئەو نەبێ •• ئاوایی چۆن بژی ؟!

**کوێخـا :**

تۆ نەتوت •• چۆنت دی ؟
چۆن زانیت ؟!

**پیرۆت :**

چۆن زانیم ؟! من لە پاڵ گابەردە شینەدا
کە دوایین بژوێنی ئەمساڵە
تروشکەم کردبۆ ، رانەمەڕ لەو لاوە
لەوەڕگەی •• بۆ خۆش‌بۆ مڕبۆبۆن
لەناکاو •• بارژنی ئاسکەکە •• هاتەگوێم
داچڵەکیم ••
بارژنێ •• لە بارەی جارانی نەئەچۆ
بارژنێ •• لە قیژە و زریکەی ژن‌ئەچۆ
کەچۆم و دۆر بە دۆر سەیرم‌کرد
زانیم‌چی قەوماوە •• مامەوە •• مامەوە
بێ‌هودە •• ئەویش هەر زریکەی لێ‌ئەدا
« سوارە بە شڵەژاوییەوە دێتە ژۆرەوە »

**ســواره :**

داخ .. داخ .. داخ
چۆن راسته ؟! ترۆپکی رەوەزی قەلەڕەش ؟!
له کوێی‌تر گیربوایه و هەر ئەوێ نەبوایه
هەوالی وەها شوم قەت خەزان بیستوێتی ؟!

**کوێخــا :**

ئەو وەهای له چارە نوسراوە
دەسەلات که نەبــو ..

**وســو :** « قسەکەی پێ ئەبڕێ »

ئەو نەبێ چۆن بژیــن
بینایم خەریکه لێڵ ئەبێ
بەر پێی خۆم نــابینم
مەرگی خۆم ئەوێت و .
مەرگی ئەو نەبینم !

**ســواره :**

« وەك شتێکی بیربکەوێتەوە »
بۆ لێرە ئەبلەق بوین ؟
با بچین ببینین
با بچــین بزانــین

**کوێخــا :**

ئارەزوی خۆتــانه !

**وســو :**

نەء .. ئەچــین

**پیرۆت :**

ئا .. سواره راست‌ئەکات

با بڕۆین •• بابڕۆیـــن
ببینـــین •

**« ئەچنەدەرەوە ، تاریکی »**

« ڕوناکی ، حیکایەتخوان دێتەوە سەر شانۆ »

**حیکایەتخوان :**

بینیتان و گوێتان لێ بـــو
هەواڵەکە نەك وەك بەردێ
وەك کەندەڵانێ بڕوخێ و ،
بکەوێتە •• گۆمی ناخی خەزانەوە
ئـــاوەها بو ••
کارەساتی ئەم هەواڵە ••
ماڵ بە ماڵی نـــاو خەزانی
هەژان و ، دێ
دایگرت •• تەمێ

**« وچان »**

بۆ ئەوەی بزانن •• ترۆپکی ڕەوەزی قەڵەڕەش
چەند تۆشە و •• کام ترسی چارەتوس
چاوەڕێی ئاسکی پیرۆزی •• گیرخواردوی •• ئەوێیە
کارەسات •• چەند گەورە و دژوارە
با گوێمان لە قسەی پیرترین مرۆڤی خەزان بێ
چی ئەڵێ •• چۆن ئەدوێ دەربارەی
ئەو خەم و ئـــازارە

**« ئەڕوات ، تاریکی »**

« شـانۆ ڕوناکئەبێتەوە ، جێگە ژورێکی گوندی ئەو سەردەمەیە ، ـباپیرـە کە پیرەمێردێکی ئێجگار بە ساڵاچووە لەگەڵ هەر دو کوڕە زازاکەی‌دا دانیشتون، خەمبـــارن » .

**مەمەنـد ، منالی یەکەم :**

باپیرە •• تۆ دیوتە ؟ تۆ چوّیتە
سەر لوتکەی رەوەزی قەلەڕەش ؟!

**بـاپیر :**

مەمەندە •• باوکەکەم
دور بە دور •• من دیومە
بەلام چون ••
کوڕەکەم •• هیچ کەسێ ناتوانێ بچێتە سەر لوتکەی
زۆر گران •• بشگەنە •• نزیکی
ترۆپکی رەوەزی قەلەڕەش
هەر باڵدار ئەتوانێ هەر باڵدار ••

**زۆراب ، منالی دووەم :**

« قسەکەی پێ ئەبڕێ »
باپیرە •• ئەی ئاسکە موبارەك
چۆن چووە ؟!

**بـاپیر :**

زۆرابە •• کوڕەکەم
باڵندە •• ئەچێت و دێتەوە
هاتنەوە •• گرنگە •• هاتنەوە
بەرانە کێویەکان •• ئاسکەکان
کام رێگە باریکە پیا ئەڕۆن
ئەتوانن بگەنە سەر هەمو ترۆپکێ
بەلام •• کە ••

**« کۆکەیەك ئەیگرێ »**

**مامەند :**

باپیرە .. بەڵام چی ؟!

**باپیر :**

بەرخەکەم .. مەمەند گیـان
رەوەزیش تا رەومز کەوتووە
ترۆپکی رەوەزی وا هەیە
وەك سـەری قەلەڕەش
ئەیگەنێ.. بەڵام بۆ هـاتنەوە
ناتوانن بێنەوە
گیر ئەخۆن وەك ئاسکەموبارەك
گیر ئەخۆن .. داخەکەم .

**زۆراب :**

ئاخر بۆ بـاپیرە ؟!

**باپیر :**

کوڕەکەم .. باوکەکەم ، لەم سەریان
کە ئەچن بە قەدەر یەك جێ سم
رێ هەیە پیـا ئەڕۆن
ـ حاڵیبۆی بەرخەکەم ـ
لەو سەریان گەر رەوەز تەواو بۆ
بواری تیا نەما وەرچەرخێن . بسوڕێن
ئەوساکە .. گیرئەخۆن
وەرچەرخان .. بۆ جێ سم .. لەو سەریان
ئەی نابێ هیچ نەبێ لە سمێك
بواری زیاتربات ، هەتاکو بسوڕێ و بێشتەوە
وا نیە باوکەکەم ؟!

**مامەند :**

باپیرە .. دوای ئەوەی

نەیتوانی وەرچەرخێ

دوای ئەوە ؟!

**بـــاپیر :**

دوای ئەوە هەڵدێرە و بۆ خوارێ

بۆ خەرەنـــد

هەتا چاو ببینێ قووڵ قووڵ و تاریکە

بیرێکە .. لە نێوان دوو شاخا

گەر بڕۆن ئەکەونە خوارەوە

وەرچەرخێن .. دیسان هەر

ئەکەونە خوارەوە !

**زۆراب :**

ئەی چێیکەن ؟! بـــاپیرە

ئـــەی چێیکەن ؟!

**بـــاپیر :**

لە جێگەی خۆیاندا .. ئەوەستن .. نابزوێن

تەنیا هەر بازەباز ئەکەن و هیچی تر

حـــاڵیبوون ؟!

**مامەند :**

حاڵی بووین .. باپیرە .. حاڵی بووین

بەڵام بۆ باپیرە ئەچنە سەر

لووتـــکەی وا ..

هەموو جار هەر ئەچن ؟!

**زۆراب :**

لەبەرچی باپیرە ؟! خۆ ئاسکە موبارەك
لەوە و پێش نەچۆتە شوێنێکی وا عاسێ
ئەی ئیستە بۆ چووە ؟!

**بــاپیر :**

باوانم ، هەمۆ جار هەرناچن
تۆش ئەبن .. تۆش ئەبن

**هەر دۆکیان بەیەك دەنگ :**

لەبەرچی ؟!

**بــاپیر :**

کە کاتێ پایزان
داروبــار رۆت‌ئەبن
بەرد بەردی شاخ و داخ
ئەکەونە بــەر چــاوان سەر تا بــن
پەرژینی سروشتێ حەشار و لانەکان
بەجارێ ئەوەرێن
جانەوەر .. دەعباکان .. زۆرئەبن
بۆ نێچیر ئەگەڕێن
ئەو کاتە کە ئاسکێ کەوتەبەر
تەماشــای دڕنــدە
دڕندە بۆی ئەچێ و ئەو هەڵدێ
نــاچارە و هەر هەڵــدێ
ئەو ساکە لە تاوا رێیەکی وا ئەگرێ
کە تا سەر دڕندە نەتوانێ

دوی کەوێ

حاڵیبوون ؟!

**« وچان »**

**مامەند :**

ئەی باشە باپیرە لە ترسا

وا ئەدا لە باڕژن

ئەترسێ ؟!

**بـاپیر :**

ئا کوڕم ئەترسێ و هاوارمان بۆ دێنێ !

**زۆراب :**

چی ئەڵێ ؟!

**بـاپیر :**

بانگ ئەکا

لەم جێیەم قوتارکەن

لەم جێیـــە خەڵکینـــە .

**« وچان ، تاریکی »**

« شانۆ ڕۆناك ئەبێتەوە ، شوێن ناو ئاواییە ، کوێخا و مام وسۆ پیرۆت و سوارە هەموویان بە کۆمەڵ دەگەڕێنەوە و ئەمجارەیان پیربالیشیان لەگەڵە » .

**سـوارە :**

هەرئەبێ دڕندە .. سا ئیتر چۆن بووە

دیارە هەر .. ویستوێتی .. کە بیخوا

بەم دەردەی بردووە

جا ئیتر گیانی خۆی لێبۆتە تەوقێك و ،

خستوێتییە ســەر ڕەوەز

ئاخ ئاسکە موبارەك

داخی تۆ چەند گەورە و گرانە

**کوێخــا :** « بە ساردوسڕییەوە »

قودرەتی تەنیا خوا ئەتوانێ
ئەو ئاسکە قوتارکا
ئەگینا مەحاڵە ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌.. بینتیان لەکوێیە !

**پیرۆت :**

کە بازڕن لێ‌ئەدا .. وەختە من
لە جێی خۆم گڕبگرم
روانیتان چاوی چۆن بڕیبوە تێو چاومان
لە تاوا .. زمانی گرتووە

**پیرباڵ :**

چۆن سەری .. ئاوەها .. لێ‌تێك چۆ ؟!
پرسێکە وەك چەقۆ
چەقیوە لە دڵم

**وســۆ :**

مام پیرباڵ .. تۆ دنیا دیتەیت و ئەزانی
کە دەعبای ئەم وەختە چەند برسیین
چەند دڕبن .. هێندەی‌تر .. دڕئەبن
نە جێگەی لەوەڕەو .. نە جێگەی هیچ شتێ
بە تەنیا هەر جێگەی ترس و بیم
ناچارێ و بێکەسێ .. پیرباڵ گیــان

**ســوارە :**

رۆژێکە ئێجگار شــوم
ئاخ خۆزگە کوێرێتیم ئەبینی و ،
نەمدیایە ئەم وەختە

نەمدیایە کە ئاسکە موبارەك
وای لێ دێ
نەتوانێ ببزوێ

**کوێخـا :** « بەگومـانەوە »
مام وسۆ •• هەر ئەبێ دڕندە
بەم دەردەی بردبێ ؟!
ئەی نابێ خۆی •• ڕێێ لێ •• تێك چوبێ ؟!

**وسـۆ :**
قسەی سەیر
چ ملە و •• ڕێگەیەك •• تەنانەت هیچ بەردێ
نیە ئەو شارەزای نەبـۆبێ ••
قسەی وا •• هەر نەکرێ باشترە

**پیرۆت :**
بزنەکان •• ئەزانن ڕێی ڕەوەز .
کامەیە و نایگرن ••
ئەی چۆن •• چۆن ئاسکەموبارەك
ئەیگرێ ••
ئەو کاتە قسەی وا ڕاست ئەبۆ
بە چیا نوێبوایە و •• ئەو کاتە ئەمانوت
ڕەنگ وایـە ••
کە سەری لە ڕێگە دەرکردن شێوابێ

**سـوارە :**
کارەکە هەر کاری دەعبایە و هیچی تر
ئیستاکەش بە ئێمە چی ئەکرێ ؟!

**وسـۆ :**

ئەزانن •• هەمۆتان •• ئەزانن
کە ئاسکە موبارەك دێرینەو ،
دەمێکە لە سای ئەوەوە ••
خەڵك و خوای ئەم دێیە
هەر خێریان بە سەرا باریوە
لە چاوی ئەوەوە ، دەرۆنیان ، بە خەڵکی
دوای خەزان ناسیوە
کێ هەیـە نکۆڵی لێ‌بکا ؟

**پیربال :**

کێ هەیە ؟! ئاشکرا
وەکو خۆر •• شتێکە لەبەرچاو

**پیرۆت :**

کە ئاسکە موبارەك •• دڵ‌تەنگ‌بۆ
دێکەمان دڵتەنگە
تەنگانەی کە توش‌هات
تەنگانە ئەبینین

**کوێخـا :**

شتەکە هەر لەدەس خوا دایە
بە ئێمە چی‌ئەکرێ !

**وسـۆ :**

کارەسات ئەوەیە •• کە ئاسکە موبارەك
نەمێنێ هیچ شتێ نامێنێ
ئەو تەنیا یەکێکە و •• قەت‌نابێ بە دۆ
لە دوای ئەو خەزان و ئەم خەڵکە

وەك نەبن وەهایە
هەر تەنیا بارکردن ئەمێنێ و هیچی‌تر
بارکردن .. لە خەزان
یان .. شەیتان داڵدەدان

**پیربال :**

مەلای دێ .. ئەڵێ چی !
دیار نەبو .. نایبینم ..

**کوێخـا :**

لەلای‌بوم .. کەوتوە و نەخۆشە
ئەفەرموێ .. شتەکە هەر لە دەس خوادایە
لێ‌گەڕێن باشترە !

**پیرۆت :**

چۆن چۆنی لێی گەڕێین !!

**وسـو :**

هەر تەنیا بارکردن ئەمێنێ و هیچی‌تر

**پیرۆت :**

ئـەی چیبکەین ؟!

**سـوارە :**

ئەی هەر وا .. بوەستین هیچ نەکەین
باڕژنی نـابیـن
وا کێوی کرد بە ئـاو

**کوێخـا :**

چی‌ئەکەیت ؟! ئەتەوێ چی‌بکەیت
باڵ‌ئـەگری یان ئەفڕی !

**پیرۆت :**

شتێ بێ هەر شـــتێ کە بکرێ

**پیربال :**

هیچ ئـــەکرێ ؟!

**وسـو :**

چۆن نـــاکرێ !

وا بارە و هاتوە و لـــەم رۆژە

تەنگانەی تاریکتر کوا بووە

ئیستاکەش هەمۆتان وا لێرەن

زانیمان کە ئاسکەمو بارەك عاسییە ،

ترۆپکی رەوەزی قەلەڕەش جێیەتی

زانیشمان هەر ئەبێ دڕندە

بەم دەردەی بردبێ

بەلام ئەی نەجولێین !

**کویخـــا :**

مام وسو •• لە رێی خوا •• بەرەو کوێ

ئەجولێی •• باڵندە ئەگاتە ئـــەو جێیە

باڵندەی ؟!

چی ئەکەی چار نییە

**پیرۆت :**

بمرم و نەبینم بارئەکەم لە خەزان

ئەو مەرگە و •• نەك رۆشتن

**پیربال :**

بارکردن •• ستەمە

**وسۆ :**
زۆر راسـتە ..
هەمو شـت لە دەستی خوادایە
بەڵام خواش تا ئیستە
دڵتـەنگە
کە ئاسکەموبارەك عاسییە
تا ئەویش دڵتەنگـە

**« وچان »**

(ـ باپیر ـ ی خەمە )شم بینیوە ..
پرس و ڕام بەویش کرد
ئەویش هەر تاووتوی بەکێشەی گرانکرد
گوێبگرن :
دڵنیام کەس نییە .. بگاتە ترۆپکی رەوەزی قەلەڕەش
گوێبگرن ، شاخەوان ، چاونەترس
ئەوانەی کە رۆحیان ئەخەنە ناو مشت و سەر دەستیان
ئەتوانن بە قۆناغ .. دوای ئەوەی قولاپە
لە کاڵە و پێتاوی تایبەتی گیرئەکەن
دوای ئەوەی کە دەستیان
بە ئەڵقە گوریس بۆ هاویشتن رامئەکەن
سوك سوکە ئەتوانن بچنە پێش
بگەنە نزیکی
لەوێوە ئەڵقەکە بهاون بیخەنە ناو ملی
ئەو شوێنەی من ئەیڵێم شاخەوان بیگاتێ
گەر بگات .. هەر گوریس هاوێژێ دوورە لێی
ئەمەشیان هەروەها ئاسان و سوك نییە ..

گرانــه و زۆر گران

« وچان ، هەمو مات ئەبن »

**کوێخـا :**

له ڕێی خوا ٠٠ مام وسو ٠٠ چی ئەڵێی
بۆ خەڵك به كوشت چێ
ئەمەی تۆ باستكرد له وزەی كێدایه
هەر پێیەك بترازێ
مەرگه ٠٠ مەرگ
كێ ئەوەی پێئەكرێ
ئەم خەتەی تۆ كێشات
مەگەر شێت ڕوی تێكات
یان ئەوەی به دەوری مردندا گڕئەخوات

**وســو :**

ئا ٠٠ كوێخا ، ئا ٠٠ ئەبێ ٠٠ بۆ ئاســكەموبارەك
ئەوانه بێنــه پێش
به دەوری مردندا گڕئەخۆن

**پیربال :**

ئەمەشیان ٠٠ ستەمه

**پیرۆت :**

ســتەمه ٠٠ بەڵام ئەی نازانن
كه ژیان دوای ئاســك
ئەویشیان مردنه ٠

**ســواره :**

به راســتی مردنه

**پیربال :**

مام وسۆ •• ئەو پیاوە لە کوێوە بهێنین
بۆ ئەوەی ئەمەی تۆ ئەفەرمۆی
بیکات و هەناسەی رەحەتی هەڵکێشین

**وســۆ :**

کەس نایە •• پیربال گیان •• کەس نایە
ئەو •• پیاوە هەر ئێمەین
کردمان وا ئەیکەین و نەشمانکرد
چاوەڕێی کەس مەکەن
کەس نـــایە

« وچان ، لەسەر قسەکردن بەردەوامە »

مەگەڕێن بۆ رێی تر ••
رێگەکە تەنیا هەر یەك رێیە
جێگەکەش یەك جێیە
وا ئێمە لێرەین و ، ئەویشە لەوێیە
نە ئێمە باڵئەگرین •• نە ئەویش
هەتا زوش بە فریای بکەوین
درەنگە •• چی ئەڵێن ؟

« وچان ، هەمو بێدەنگ ئەبن ، لەم کاتەدا ، یەکێك خۆی ئەکا بە ژوردا و رو ئەکاتە هەمویان» :

وا دیـــارە ئاگاتان لێ نییـــە
پێش تۆزێ
مەلای دێ
ئێوە خۆش •

« هەمو تەماشای یەکتری ئەکەن ، تاریکی » .

# تابلۆی پێنجەم

« ڕوناکی ، حیکایەتخوان دێتەوە سەر شانۆ » .

**حیکایەتخوان :**

هەواڵی مردنی مەلای دێ
خەمێ بو ••
هەر زۆر زو
لە خەمە گەورەکەی ئاسکدا
توایــەوە و ونیش‌بو
خەڵکی دێ کێشەی ناو دەرامەت •
خۆیانیان بیرچۆوە
کەم و زۆر ئاڵان لە :
پەژارەی ئەمڕۆوە
کەوتنە ناو گێژەنی ڕوباری سەرکێش و ،
کارەسات خستنیە بەردەمی مەترسیی ،
بەســەرهات •
بۆ ئاســك نەجاتدان
تەنیــا ڕێی شك‌بردو
ئەو ڕێگە توشەیە . دیاریێ‌کرد مام وسو
چۆن ڕێـەك ؟! لە هەمو بستێکا

مەرگ وەك پاسەوان
وەستاوە و چاوەڕێی نێچیرە بۆ قوت‌دان
وا ئێستەش کوڕە شوان
لە نێوان دوو دەمی بەرداشدا
بـــۆ ئاسك و بۆ خاوەر
زامێکە فوارەی خوێن هەڵئەدا

« ئەڕوات »

« ڕووناکی ، قەد پاڵی چیایە ، کوڕەشوان تەنیایە و شپرزەیی بە روخسـار و هەمو بزوتنەوەیەکێوە دیارە ، بیرئەکاتەوە و پەشێوە ، کۆمەڵێ منالی گوندیش دێن و ئەم گۆرانییەی بۆ ئەڵێن ، ئەویش وەك لەنـــاو ئەو وڕێ و کاســێتی و شپرزەییەی خۆیدا ئەم دیمەنە وەك خەوێ ببینێ وەهایە » .

**کۆرسی کوڕ و کچی منالان :**

هۆ پیرۆت ئەی شوانەی بەرچاو روون
وا چیا بەرد بەردو دار داری ،
هاواری تۆ ئەکا .
وا نیگای هەژاران وەك تەیری هەڵکورماو ،
تەماشای تۆ ئەکەن .
بەیتی دڵ بە بازو و بە جەرگی
نەترســـتا هەڵئەدەن

**کچێکیان :**

کچانی سەر کانییە لێڵەکەی ئێستای دێ
ئاوێنە و شانەیان
خستۆتە کەنار و ژاکاوە بریقەی
ئەو قژە رەشەیان

**کوڕێکیان :**

جێ ژوان گوارەی گوێ و ،
موستیلەی ناو پەنجەی
یارانی تیا وەرێ
جرجەکان بە کۆمەڵ خاکی سەر ،
گڵکۆیـــان هەڵدڕێ

**هەموویــان :**

هۆ پیرۆت ئەی شوانەی دەروونپاك
ئاسکەکەی سەر چیا
پێش هەموو عـــاشقیك تۆی ناسیو ،
وا ئیستە ئەو بانگی تۆ ئەکا
هۆ پیرۆت منالان دیلاتیی
جۆلانەی ناو لقی
دار گوێزیان لێت ئەوێ
هۆ پیرۆت منالان ئاسکەکەی
ئازیزی خەزانیان لێت ئەوێ

**کچێکیان :**

کیژانی دێ ئەڵێن :
بەهارێ بێتەوە لەگەڵ کوڕ
نـــاچینە ڕێواســـان
هەتاکو نەزانین وا پیرۆت
ئاسکەکەی داگرت و خستیە سەر :
نەڕەی شان

**کوڕێکیان :**

باپیرەی دەس لەرزیو

سنگ لەسەر گۆچانی
بە هەر حاڵ راوەستاو
ئەڵێ : کەی کوڕە شوان ئەڕوات و ،
پێش مردن ببینم بە دوو چاو

**هەموویـان :**

هۆ پیرۆت ئەی کوڕی بەفر و با
دڵداری کارێز و ، مانگی ئاڵ
لە سینەی دایکانا کەی مژدە ئەڕوێنی
تا بمرێ درك و داڵ
هۆ پیرۆت ئەی شوانەی عاشق و ،
بەرچاورۆن •• وا چیا
بەرد بەرد و داری هاواری
ئەوینی تۆ ئەکا •

**« ئەچنە دەرەوە »**

**پیرۆت :**

« وڕ و کاس و مـاندووە ، داهێـزراوانە هەڵئەسـێتە سـەرپێ ، بە پەشۆکاویـەوە » .

ئاخ خاوەر چاوانت ئاخ خاوەر
ئاخ ئاسك چاوانت ئاخ ئاسك

« بێدەنگ ئەبێ ، ئەم دەنگانەی دێتە گوێ » .

**دەنگی یەکەم :**

گێژەنی مردنە •• راپێچت ئەکات و ،
بەرەوبن ••
لەمیاندا هاتنەوە هەر نیە
خۆ روانیت لە کوێیە !

ترۆپکێ هەر باڵدار ئەیگاتێ و دێشتەوە
وەکو قەل قەلەڕەش
ناوی خۆی وا بەسەر خۆیەوە
بە قسەی مام وستۆ مەکەوە داوەوە
ئەو فێرە هەر تەڵە دابنێ
ئاسکێکە بۆ نەبۆ بە تۆ چی ؟!
ئەی خاوەر لە بیرت‌چۆتەوە ئەی خاوەر
ئەی ڕەنجی تا ئیستەت ؟
ئازاری شوانکاریت لە بیرت‌چۆتەوە ؟!
چەند ساڵێ ئارام و .. خاوەر هەر .. بۆ خۆتە
بیهێنە پێش‌چاوت ئەو سنگ و ،
ئەو مەمك و گەردنە
بیهێنە پێش چاوت ئەو ڕان و ،
ئەو پوزە گۆشتنە ..
ئەو لێوە گەرمانە .. مژینی دۆ بە دۆ
کە ئاگر بەر ئەدەن
لە پوشتۆی ئارەزۆ .
ئەی ماچی لا ملی سپی و سۆڵ ،
ژێر چەنەی خرپنی .
چی هەیە بگاتە ئەو تامەی ئەداتێ
لە باوەش گرتنی .
بەڵێنە و کوێخا قەت .. بەڵێنی ناشکێنێ
واز لە تۆ چۆن دێنێ !
ڕێگەکەت هەر ڕێگەی نەهاتە

ڕێیەکە هەر بە حاڵ
پێت لەسەر بترازێ
ئەزانی چیت لێدێ ؟!
خۆ تۆزی بەرەودوای کاروانت بینیوە
ئەبیتە ئەو تۆزە و با ئەتبا .. با .. با .. با
بیزانــە

**پیرۆت :**

« بە شپرزەییــەوە »
ئەزانم .. ئەزانم .. ئەزانم
ئاخ خاوەر چاوانت ئاخ خاوەر
ئاخ ئاسك چاوانت ، ئاخ ئاسك
لە نێوان شەپۆلی دوو چاوی ئێوەدا
وەك پوش و پەڵاشی
ئیستەکەی سەر چەمم

**« وچان »**

**دەنگی دووەم :**

لە چاوی خاوەردا
بە تەنیا کوژەشوان ئەسوتێ
لە چاوی ئاســكدا
خاوەر و شوانیش و هەموو دێ .
هۆ پیرۆت کە ئاسك نەمێنێ
تۆ و خــاوەر
لە کوێدا دای ئەنێن دڵداری و ،
سەودای سەر ؟!
کە ئاسك هەڵدێررا بۆ خەرەند

چۆن پەنجــە ،
ئەتوانێ شمشاڵت بۆ بگرێ و ،
کلاوت چۆن قنجە ؟!

**دەنگی یەکەم :**

تۆزقاڵێ پێت لەســەر ،
ملەی بەرز ٠٠ بترازێ
هۆ پیرۆت ئەزانی
ئەزانی چیت لێ دێ ؟!

**دەنگی دووەم :**

ئەزانی ٠٠ هۆ پیرۆت
ئەزانی دوای ئاسك
تەنانەت ژیانیش نامێنێ
بۆ بنچــك !

**« وچان »**

**پیرۆت :**

ئاخ ئاسك چاوانت ئاخ ئاسك
ئاخ خاوەرچاوانت ئاخ خاوەر !!

**« وچان »**

**دەنگی یەکەم :**

ئەڵێی چی ؟! نەهێڵی
مام وسو ٠٠ تەڵەکەی
لە دڵتا بتەقێ
پێت ئەڵێم هۆ شوانــە
قەت نەکەی
بەو فێڵە بڕواکەی !

**دەنگی دووەم :**

ئەو کاتە چاوانت رۆشنەو ،
بێ گێژاو ناو سەرت
کە ئاسك دابگری و ،
بیخەیتە باوەشی خاوەرت

**دەنگی یەکەم :**

هەر بە حاڵ پێت لەسەر پلەی خز بترازێ

**دەنگی دووەم :**

لە چاوی ئاسکدا خاوەر و شوانیش و هەمو دێ

**دەنگی یەکەم :**

هەر بە حاڵ پێت لەسەر پلەی خز ...

**دەنگی دووەم :**

لە چاوی ئاسکدا خاوەر و شوانیش و ...

**دەنگی یەکەم :**

هەر بە حاڵ پێت لەسەر ...

**دەنگی دووەم :**

لە چاوی ئاسکدا ...

**دەنگی یەکەم :**

هەر بە حاڵ ...

**دەنگی دووەم :**

لە چاوی ...

**« وچان »**

« پیرۆت لە پۆپەی هەڵچون و پەشۆکاوێ و شپرزەییدایە، دەنگەکان وایان لێکردووە ، خستویانەتە گێژاوی زۆرانبازییەکی دەرونیی گران و دژوارەوە » .

**پیرۆت :**

« کاسەو ، لەبەرخۆیەوە »

هەر بە حاڵ پێت لەسەر پلەی خز بترازێ

**« وچان »**

لەم کاتەدا سوارە دێتە ژوورەوە و لە پشت پیرۆتەوە ئەوەستێ .

**پیرۆت :** « هەر لەبەر خۆیەوە »

لە چاوی خاوەردا •••

بە تەنیا کوڕەشوان ئەسوتێ

لە چاوی ئاسکدا

خاوەر و شوانیش و هەمو دێ

**« وچان »**

**سوارە :**

ئەوە چیتە پیرۆت گیان !

**پیرۆت :**

« لە دەنگی سوارە دائەچڵەکێ و روی تێ ئەکا و وەك بەو بڵێ » .

کە ئاسك هەڵدێررا بۆ خەرەند

چۆن پەنجە ،

ئەتوانێ شمشاڵت بۆ بگرێ و ،

کڵاوت چۆن قنجە ؟!

**سوارە :**

ئەڵێی چی ؟!

چیتە پیرۆت ؟

**پیرۆت :**

« بە دڵنیایی و بڕواوە »

سوارە گیان من ئەڕۆم

ناتوانم دانیشم و ئاسکی دێ
ئاوەها عاسی بێ و ،
لە زامی دێرینما بارەی بێ •

**« ئەچنە دەرەوە ، تاریکی »**

« رۆناکی ، کۆرس دێتەوە سەر شانۆ »

**کۆرس :**

کوڕە شوان
پیرۆتی شارەزای یەك بە یەك
بن دارو بن بەردی سەر چیـا
بەرەو ڕۆی هەڵەمۆت
کەوتە ڕێ‌و ،
گوریسی لە ناو قەد شەتەكدا
گەرداوی دۆ دڵی لە سەریا نیشتەوە و
سامانی سەوداکەی
پرشنگی رژانە شەبەقی رێی ئالی

**تاك لەناو کۆرسەوە :**

ئەوینی خاوەریش لە گیانیا
وەك چرای بەر هەنگاو
ئەڕۆشت و ، لە کۆچی مەترسی و ،
سامداریا داگیرسـاو •

**کۆرس :**

ئەڕوات و ئەزانێ کە رەنگە
دوا جاربێ خاوەری ببینێ
ئەڕوات و ئەزانێ

که ڕەنگە دوا جار بێ
چاوانی ببینێ •

**تاك لەناو کۆرسەوە :**

کوڕەشوان چۆن بـانگی
منالآن کپ ئەکاو ،
لەدڵیا بێ وەرام ئەینێژێ
ئەو ئارام چۆن ئەگرێ
ببینێ ، وا تەوری
« کوێخا »ی زق
داربەڕۆی چیاکەی ئەکوژێ

**کۆرس :**

چۆن ئەگات ؟! چی ئەکات ؟!
ئەی خـاوەر ؟!
چۆنە سەر ، هاتنە خوار ؟
لە دێدا •• ڕۆشتنی کوڕەشوان
بۆ بە ویرد لە سەر زار

**« تاریکی »**

« هەر دوابەدوای چۆنە دەرەوەی کۆرسی سەرەکی ، ئەم دیمەنانە یـەك لە دوای یەك و بێ ڕەوینەوە نیشان ئەدرێن »

**دیمەنی یەکەم :**

« جێگە سەرە ڕێی کاروانە »

**حەمەی قەتارچی :**

« بانگی ڕێبوارێ ئەکات »
هۆ برا •• هۆ برا •• بێزەحمەت
تۆ مەڕۆ •• پرسیارێ !

**ڕێبوارەکە :**

« دووای ئەوەی ئەگاتە لای » .

فەرمۆ •• کاکە •• فەرمۆ

**حەمەی قەتارچی :**

کاکە گیان •• لە کوێوە هاتویت و

بەرەو کوێ ؟!

**ڕێبـوار :**

لە گوندی خەزان و چیاوە •• هاتوم و ،

بەرەو شار مل ئەنێم

برا •• بۆ ؟!

**حەمە :**

تکایە •• هەواڵی خەزانمان پێ ناڵێی

مانگێکە لێی دوورین

وەك ئەڵێن شێواوە ••

نازانین •• ڕاستە •• یان ؟!

**ڕێبـوار :**

تابڵێی شـێواوە •• ئەوەتا نامبینی

ئەمەوێ لە گێچەڵ قوتاربم

**حەمە :**

چاك ئەکەی !

کەواتە دەنگ و بـاس ••

وەك چۆنم بیستبو •• وەهایە

ئەی باشە کوێخا هەر :

لە وێیە ؟!

**ڕێبـوار :**

تا ئیستە •• لەوێیە

ئەگەرچی • دڵنیام •• بارئەکا !

**حەمە :**

ماڵ زۆرن •• کۆچ بکەن

جێبێڵن •• دێی خەزان ؟!

**ڕێبـوار :**

ئەیانوت •• چەند مـاڵێ

چاوەڕێی کاروانن

تا خەزان جێبێڵن ••

**حەمە :** « بەپێکەنینـەوە » .

زۆر باشە ••

خوات لەگەڵ کاکە گیان •• خوات لەگەڵ

« ڕێبوارەکە تێئەپەڕێ » .

**حەمە :** « ئەکەوێتە پێش کاروانەکە و لەبەر خۆیەوە ئەڵێت » .

دەرفەتە و •• ڕێکەوتی وەها چاك

دەگمەنە ، پەلەکەم باشترە

هیچ نەبێ بۆ ئەو سەر چەند ماڵێ

بارئەکەم •

ناوەختە هەرچەندێ داواکەم

ئەمدەنێ . لە ڕۆژی وەهادا

کێ سەری مامەڵەی ئەپەرژێ

پەلەکەم باشترە •• دەرفەتە ••

لێ خوڕن •• دەرفەتـە

**« ئەڕۆن ، تاریکی »**

**دیمەنی دووەم :**

« مالی کوێخایە ، کوێخا و کوێخاژن بەرامبەری یەك دانیشتوون ، (خاوەر)یش کزو غەمناك لە گۆشەیەکدا هەلتروشکاوە »

**کوێخا :**

خوا غەزەب لە بەندەی خۆی بگرێ
وای لێ دێ ..
شێت بووە .. ئەگینا کەس بووە
شالاو بۆ ترۆپکی رەوەزی
وا بەرێ !
بەرێگەی مردنیا مل بنێ
تۆ دیوتە هیچ کەسێ
ئەوەندە نەگبەت بێ و چارەڕەش !

**کوێخاژن :**

ئەوەتەی .. ئەم ئاسکە گیربووە
ئەم خەلکە .. نە ، نوستن ..
نە ، خواردن .. نە .. پشوو و
هەر هیچی نەماوە ...
کوێ ئەچی باس باسی ئەمەیە
دواییشی نایەت و بسرەوین .

**کوێخا :**

دە بلێ ئاخر تۆ چیت دابوو لەم بەزمە
ئەوا خوا ناتێکی شوانێتی دابویتێ
ئەتخوارد و سەری خۆت کزئەگرت
نەگبەتی رووی کردە هەر کەسێ
وای لێ دێ ! ..

**کوێخاژن :**

پیاوەکە ! شوانی چی
تا شمشاڵ لێدانی هەبوایە
مەڕی چی و بزنی چی !
تۆ بڕۆ و بڕوانە ..
پەراسوی یەك یەکیان بژمێرە
شوانی چی ؟!

**کوێخـــا :**

ئەم ئاسکە بۆ بەچی
نان ئەدا .. ئاو ئەدا
نەگبەتی .. نەگبەتی

**کوێخاژن :**

بە سەری خۆیان و باوکیشیان
تا ماون نایبینن ئەو ئاسکە بێتەوە
کوڕەشوان دای ئەگرێ ..

**کوێخـــا :**

پێموتن .. ئەڵێی چی .. پێموتن
فیت فیتی وسووە
کە یەکێ خوا عەقلێ نەدایە
هەر .. وایـــە !

**کوێخاژن :** « بە دەنگێکی نزم »

سەر بـــاقی گشت داخێ
ناوی ئەم کچەشمان .. وا زڕا .. بەوەوە
ئەمەشیـــان داخێکە ..
سەر باقی گشت داخێ

**کوێخـا :**

خەمەخۆ .. بێشتەوە .. تەگبیرم کردووە
چیم داوە لە گێچەڵ
لێرە نا .. لەولای تر ..

**کوێخاژن :**

ئەی چییە ؟!
بۆچی خوا هەر ئێرەی داناوە
خەزان نا .. جێگەی تر ..

« لە پڕێکدا ، خاوەر بە توڕەبونەوە هەڵئەسێتە سەرپێ و ڕۆیان تێئەکا و بە قوڕگێکی پڕ لە گریانەوە ئەڵێ » :

**خـاوەر :**

کێ ئەڕوا .. با بڕوا .. بشمرم
هەر خەزان جێگەمە .
« کوێخا بۆی هەڵئەستێ و ، شانۆ تاریك ئەبێ »

**دیمەنی سێیەم :**

« لەپاڵ درەختی باخێکدا مام وسۆ و سوارە ئەدوێن و ، مامەندیش خۆی لە پەنا بەردێکا شاردۆتەوە و بە دزییەوە گوێیان لێ ئەگرێ »

**سـوارە :**

هەر ئەڵێی وام لەسەر ئاگرێ
دانیشتوم ــ
مام وسۆ بڕواکە .. دڵم هەر وا لەلای
ئەوەتەی ڕۆشتووە بە شەویش نەنوستوم
هەر پێیەك دائەنێ هەست ئەکەم لە گەڵیام

**وسـۆ :**

هەتا بن دار «باوێ» ئەو پەڕی کەژەسۆر

لەگەڵیــا ڕۆشــتم و ..
خۆی زۆری لێکردم کە چیتر
لەگەڵیا ڕێنەکەم .. نیازم‌بۆ هەتاکو
«کروسکی» بەر گردە چۆلەکە .. هەر بڕۆم
خۆی نەی‌هێشت
بە ڕاستییش هەناسەم سوار بوبو

**ســوارە :**

گلەییت لێناکرێ ، پیرێتی و ئەو ڕێیە !

**وســۆ :**

بڵێم چی ئەو تین و تەوژمەی
جارانم نەماوە ..
داخەکەم .. بۆ گوڕی لاوێتیم

**ســوارە :**

مام وسۆ .. چۆنت دی ؟! بە پێ‌بو ؟!
ئەی ورەی ناو دڵی ؟ ئەی زاتی ؟
هەروابو وەك من دیم ،
پێش ڕۆشــتن ؟!

**وســۆ :**

هەر ئەتوت : بەرانە کێوییە ..
بۆ زاتیش کون نەبو لە جەرگیا

**ســوارە :**

تۆ بڵێی بێتەوە و ..
چاوانی خەزانیش ڕۆشن‌کا
ئەم خەڵکە لە چنگی ئەم خەمە
دەربێنێ ؟

**وسـتۆ :**

لەسەر خوا •• ڕێگەیە و لەبەرە
هاتەوە شایی دڵ بۆ گوندی خەزانە
گەر مردیش وەك عاشق ئەمرێت و ،
بۆ ئاسکەموبارەك گشت مەرگێ
ئەبێتە چراوگێ و هەڵئەکرێ
لە دڵی ئاسمـــاندا ،
بۆ خاوەر •• بۆ ئاسکە موبارەك
ڕێگەیە و لە بەرە ، ئەو نەگات
بە دوایدا •• ناهێڵین •• کەجێ پێی بزربێ
یەکێ تر •• دووانی تر •• ڕێگەیە و لەبەرە

**سـوارە :**

مام وستۆ •• یەکێکم لەوانە
منیش وەك کوڕەشوان عاشقم !
لە دڵمان •• ئەو جوتە چاوانە

**وسـتۆ :**

بۆ ئاسکە موبارەك •• بۆ یەزدان
من نا •• تۆ •• تۆ نا •• مـــن

**سـوارە :**

مام وستۆ ئەوەندەی بۆ پیرۆت
خەیـــالم پەشێوە ••
ئەوەندە و زیاتریش بۆ خاوەر
ئەزانی پلۆسکی گریـــانی ••
وەك ( فاتە ) پێی وتم
لە چۆڕە ناکەوێ

مام وسۆ •• سەودای سەر

سەودای سەر !!

**وســۆ :**

هەڤێتی ••سەفەری وا گران

بۆ دڵی دەزگیران ••

هەر مایەی ئەندێشە و جەخارە

کوڕی خۆم •• دڵداری

خەندەشە و ئــازارە

**ســوارە :**

چ کاتێ هەواڵی ئەزانین ؟

**وســۆ :**

دامناوە •• سبەینێ لە سەری « هەڵۆ »وە

بە وردی سەرنج بەم

بزانم کوڕە شوان

هەتا کوێی بڕیــوە

**« وچان ، مامەند ئەڕوات »**

**ســوارە :**

پێکەوە ، منیش دێم •

**« وچان »**

« لەم کاتەدا ، (پیربال) بە پەلە خۆی ئەکا بە ژووردا و بە پەشــۆکاوییەوە ڕۆیــان تێ ئەکات »

**پیربال :**

کوێخا خاوەری

زامدار کرد !

**« بە پەلە ئەچنە دەرەوە ، تاریکی »**

**دیمەنی چوارەم :**

« بەر دەرگای ماڵی (باپیر)ە ، زۆراب یاریی ئەکات ، مـــامەند بە راکردن ئەگاتە لای و هەناسەی سواربووە »

**مامەند :**

ئەزانی •• ئەزانی •• مام وستۆ
پێش تۆزێ •• چیئەوت •• چی ئەوت
بە سوارە •• ئەزانی

**زۆراب :**

درۆزن •• لە کوێوە گوێت لێبو
دە باشە •• چیـــان وت !

**مامەند :**

بۆ ئەڵێی درۆزن
بەو خوایە •• گوێم لێبو
لە پەنای بەردێکا •• من خۆمم ماتدابو
ئەوانیش ئەزانی لە کوێدا
هەر لەولای باخەکەی « رێحانە» ڕەشەوە
وەڵڵاهی •• هەر لەولای ••

**زۆراب :**

« قسـەکەی پێئەبڕێت »
دەی باشە •• دەی بـــاشە
مـــام وستۆ •• چیئەوت ••

**مامەند :**

پێیئەوت •• پیرۆتی بینیوە
پێیئەوت •• هەر وەکو بەرانە کێویەك
ڕێیئەکرد ••

پێی ئەوت .. هەر هیچ .. هیچ .. ناترسێ

**زۆراب :**

له دەعبــاش .. له خێویش ؟

**مامەند :**

له هیچ شت .. له هیچ شــت

**زۆراب :**

ئەی باشــه .. ئەیــانوت
کەی پیرۆت دێتــەوه ؟

**مامەند :**

نەء ، بەڵام گوێم لێبو .. مام وسۆ
پێی ئەوت بەیانی ئەچمه سەر هەڵەمۆت
لەوێوه تەماشای رێ ئەکەم
بزانم .. بزانم .. که پیرۆت هەتا کوێی
بڕیوه ، ئا .. ئا .. بیریشم کەوتەوه
پێی ئەوت .. با پیرۆت بشمرێ
چونکێکم ئەمرێ بۆ .. ئاسکەموبارەك
بۆ دوایی رۆحەکەی ئەبێ به ئەستێره
وای ئەوت .. مام وسۆ .. وای ئەوت .

**زۆراب :**

ئێ .. ئێ .. ئێ

**مامەند :**

تەواوبو ، هەر ئەوەم گوێ لێبو .

**« وچان »**

**زۆراب :**

شتێکت پێ بڵێم به قسەی من ئەکەیت ؟

**مامەند :**

چۆن چۆنی ؟ دەی بیلێ

**زۆراب :**

سبەینێ .. باپیرە نەزانێ

پێش ئەوەی مام وسۆ هەڵبسێ

ئەچینــە ســەر ڕێگای

هەر کە هات پێی : ئەڵێین :

مام وســۆ ئێمەیش دێین لەگەڵتا

ئێمەش دێین .

**مامەند :**

ئــای لەوە !

ئنجا چۆن ئەتوانــین

بە شــاخدا هەڵگەڕێین

خۆ ئێمە منــاڵین !

**زۆراب :**

کەرەشین ئەبەین و هەتا چەند توانیمان

هەر ئەڕۆین .. هەر ئەڕۆین

دوایی کە هیلاك بوین

سوارئەبین .. باشە .. هــا ؟

**مامەند :**

ئا .. باشە .. بەلام با باپیرە نەزانێ

بزانێ ناهێڵێ .. منیش زۆر ..

زۆر زۆریش حەزئەکەم

دوریش بێ .. تەماشــای

پیرۆتکەم .

**زۆراب :**

دە ••باشــە
بەیـــانیٖ •• هەر زۆر زوٖ
من هەڵتئەسێنم •
من نـــاتوٖم •

**« تاریکیٖ »**

**دیمەنی پێنجەم :**

« شانۆ ڕۆناك ئەبێتەوە ، بیٖئەوەی دەسکاریٖ هیچ دیکۆرێــکی دیمــەنی لەوەوبەرکرابیٖ ، هەرچی ئەکتەرەکانی نـــاو ئەم شانۆگەریەشـــە ڕیزبــوون ، دەرهێنەر وەك یەکەم جار لە دەستپیٖکردنی یەکەم تابلۆدا دیمــان ، دێتــەوە بەردەمی شانۆکە و ڕوٖئەکاتەوە بینەران »

**دەرهێنەر :**

میوانە خۆشەویستەکان
ئا بەم جۆرە •• شانوٖگەریٖ
«ئاسك»تان دی و ، ئا بەو جۆرەش
کوٖتایی هـــات ••
گەر ئەپرسن
منیش وەك ئێوە نـــازانم
پیرۆت ئاسکەموبارەکی •• بۆ داگیرا ؟
گەڕایەوە ؟ چی بەسەر هات ؟
لەگەڵ خاوەر بە یەکتری شادبوٖنەوە ؟
یـــاخود لە ملەی بەرزەوە
بەرەو خەرەند ، هەڵدێررا و کەوتە خوارەوە ؟
منیش وەك ئێوە نـــازانم !
ئەمجارەشیان تەنیا من بۆ ئەوە هاتم
لەبەر دەرگای

ماڵی ئا ئەم شانۆیەدا .. راوەستم و ،
ماڵئاواییتان لێبکەم
بەڵام بەر لەوەی بڕۆن و بەڕێتانکەم
ماوەم بەنێ
یەك یەك نـــاوی ڕاستەقینە و ،
ئەکتەرەکانی « ئاسك »تـــان
پێشکەش بکەم ...

« یەکە یەکە دەستئەکا بە پێشکەش‌کردنی هەمو ئەکتەرەکان ، بێدەنگێ ، بازڕنی ئاسکەکە ئەبیسرێتەوە ، تاریکێ » .

**ـ کۆتـــایی ـ**

★ ★ ★

نرخی ( ۱۰۰ ) فلسه



۲۰۰۰ دانە لەم کتێبە لەچاپدراوە
دەستپێ‌کردنی لەچاپدان ۱۹۷۸/۱/۲۱
لێ‌بوونەوە لە چاپ ۱۹۷۸/۳/۱۱

---

لە کتێبخانەی نیشتمانیدا
ژمارە ۱۹٦ی ساڵی ۱۹۷۸ دراوەتێ

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# الغزالــة

« ئاســك »

مسرحية شعرية في خمسة فصول

شێرکو بێکەس

A PUBLICATION OF THE KURDISH ACADEMY

# THE DEER

(( AASK ))

A Poetical play in five Scenes

By

SHERKO BEKAS

هونەرمەندی کورد ( عەلی مەندەلاوی ) نەخشی بەرگەکەی کێشاوە